# گورگنامە

نەجات ئەسپیندارەیی

شیعر



# گورگنامە

شیعر

نەجات نەسپیندارەیی

پێشەکی

بە پێنووسی پرۆفیسۆر

د. مارف خەزنەدار

ناوی کتێب : **گورگ نامە**

نوسینی : **نەجات ئەسپیندارەیی**

بابەت : **شیعر**

تیراژ : **٢٠٠٠ دانە**

دیزاین : **خەلیل هیدایەت مام شێخ**

بەرگ: **ئاکار جەلیل**

چاپی یەکەم: **٢٠٠٩**

شوێنی چاپ : **چاپخانەی رۆژهەلات - هەولێر**

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی

سپاردنی (١٩٩٨)ی سالّی ٢٠٠٨ پێ دراوە

(١)

ڕەمزییەت ( سیمبۆلیزم ) نیشانەیەکی گرنگە لەڕۆژی پەیدابوونی ئادەمیزاد لەسەر ڕووی زەوی و خۆدەرخستنی ئەدەبی میللی نەنووسراوی سەرزارو لەپاشان سەرهەڵدانی ئەدەبی کلاسیکی تۆمارکراو ، ئەم بابەتەی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی لەژیانی ئەشکەوتەوە بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بووە لەناو کۆمەڵی هەموو نەتەوەکانی گێتی ، بەتایبەتی لەبەرهەمی شیعری دا .

ئەگەرچی سیمبۆلیزم و ئەفسانە وەك شێوازێکی تایبەتی لەدێرزەمانەوە بۆ دەربڕینی مانا پەیدا بووەو تائێستاش هەیەو لەدوارۆژیشدا دەمێنێ ، بەڵام وەك قوتابخانەیێك لەسەدەی نۆزدەم لەناو ئەدەبی میللەتە پێشکەوتووەکانی ئەورووپا پەیدا بوو ، لەگەڵ قوتابخانەی ڕۆمانتیزم دەوری گرنگیان بووە لە گۆڕان و پێشکەوتنی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری و بوون بە ڕێبەر لەپێناوی دەوڵەمەندکردنی داهێنانی ئەدەبی لەشیعرو پەخشان دا ، بەتایبەتی خزمەتی قوتابخانەی ( هونەر بۆ هونەر) یان کردووە ،

( ٢ )

لەئـــەدەبی میللــــی نەنووســـــراوی کـــوردی ( فۆلکلـــۆر ) شـــێوازی ســـیمبۆلی وەکـــو هـــەموو نەتـــەوەکانی دیکـــە زیـــاتر بـــەکارهێنراوە ، بـــەمجۆرە حیکایـــەت و بـــەیت و بـــالۆرەی ئەفســـانەیی لەســـەر زمـــانی ئـــاژەڵ و دیـــاردەی دیکـــەی تەبیعـــەت گـــەلێك زۆرە ، وەکـــو حیکایـــەتی بزنۆکـــەو مەڕۆکـــەو دێـــوی ســـپی و ڕەش و جەربـــەزەیی و قارەمانیەتـــەکانی ڕۆســـتەمی زاڵ و ئەســـکەندەرو ئەحمـــەدو محەمـــەدو مـــەحمودو هـــی دیکـــە ، کەچـــی لەئـــەدەبی کلاســـیکی ئەوشـــێوازە کـــەمترە ، لـــەم بەرهەمـــە کلاســـیکی یـــەش دا ســـیمبۆلیزم وەکـــو شـــێواز وێنـــەی ڕوونـــترو ئاشـــکراترە ، لەئـــەدەبی کـــوردی دا ئـــەوەی بەشـــێوەی ڕۆمـــانی شـــیعری ( مەلحەمـــە ) کـــە بەشـــیعری مەســـنەوی ( جـــووت قافیـــە ) ناســـراوە دەگەیەنرێتـــە ئـــەنجام ( ١١ ، ب ب ، ح ح ... ) بـــەڵام لەشـــیعری کلاســـیکی کوردیـــدا یـــەکێتی کـــیش و قافیـــە (عـــەرووز) کـــەمتر بەشـــێوازی ســـیمبۆلی دەکەوێتـــە بەرچـــاو وەکـــو قوتابخانـــە لـــەوەی لەئـــەدەبی میللـــی دا بەرچـــاو دەکـــەوێ ، لێـــرە مـــاوەی ئەوە نی یە بەدرێژی ئەم مەسەلەیە ڕوون بکرێتەوە ،

## ( ٣ )

نـــەجات ئەســـپیندارەیی ئـــەم شـــێوازەی بـــەكار هێنـــاوە بـــۆ نووســـینەوەی چـــیرۆكی شـــیعری ( گـــورگ نامـــە ) یـــان بەگوتـــەیێكی دیكـــە ( بـــەیتی گـــورگ نامـــە ) ســـەركەوتنی لەوەدایـــە دەســـكاری حیكایـــەتی میللـــی ســـیمبۆلی ئەفســـانەیی كـــوردی و عالـــەمی كـــردووە ، هـــەروەها ئاگـــاداری هەنـــدێ لایـــەنی وێنـــەی داهێنراوی بەرهەمی ئەدەبی ڕەمزی كلاسیكی كوردیشە ،

لـــەپێش هەمووشـــتێك دا شـــوان و ڕانـــە مـــەڕو گـــورگ سەرچـــاوەی داهێنـــانی ئـــەدەبی میللـــی نەنووســـراوو لەپاشـــانا ئـــەدەبی كلاســـیكی نووســـراوبوون لەســـەردەمی ژیـــانی نەشـــكەوتەوە تائـــەمڕۆ لـــەناو هـــەموو كۆمـــەلانی نـــادەمیزادی جیـــاواز بەدرێـــژایی مێـــژوو لەســـەرگۆی ئـــەم زەوییـــەی ئێمـــە، (شـــوان ) ڕەمـــزی دەســـەلاتی عادیـــل و دلســـۆزە ( مێگـــەل ) خـــەڵك و جـــەماوەرو گـــەل و شـــەعب و نەتەوەیـــە ، ( گـــورگ ) ڕەمزی دوژمنایەتییـــە ، لێـــرەدا تێبـــینی یێكـــی گـــرنگ هەیـــە ، مانـــاو نـــاوەرۆكی شـــوان ( واتـــە دەســـەلات ) بەدرێـــژایی مێـــژوو ئـــەو عادیلـــە نـــەبووە كـــە پێویســـت بـــووە ( تیـــۆری ئـــەفلاتوون ) ، بەتایبـــەتی ڕێـــڕەوی مێـــژووی كـــورد وارەخســـاوە دەســـەلاتی عـــادیلی نـــەبێ ، دەولـــەتی نـــەبووە ، ئەگـــەر لـــەملاو لـــەلا

حکومـــەتی ناوچـــەیی ( میرنشـــینی ) بـــووبێ ، دەســـەڵات واتـــە (شـــوان) لـــەوێش دا ڕەوشـــتی گورگانـــەی هـــەبووە ، ئەگـــەر ئـــەم چەوســـانەوەیە لـــەڕووی قەومیـــەوە نـــەبووبێ لـــەڕووی ئـــابوری و کۆمەڵایـــەتی و سیاســـییەوە بـــووە ، چـــونکە لەخزمـــەت چـــینەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بووە ،

( ٤ )

نـــەجات ئەســـپیندارەیی وەســـتایانە ئەفســـانەی وەك سەرچـــاوە بـــەکار هێنـــاوە ، شـــوان ( دەســـەڵاتی عادیـــل ) دەوری لەشـــیعرەکەدا نـــی یـــە ، قارەمـــان دەســـەڵاتی ناعادیلـــەو بـــووە بـــە گـــورگ و کەوتۆتـــە گیـــانی ئـــەم کـــوردەو هـــەموو ئـــادەمزادێکی داوای ئاســـودەیی و بـــەختیاری دەکـــا لـــەژیان دا ، بـــەکورتی بەباشـــی دەزانم بـــاس لەدەســـەڵات بکـــەم ، چـــونکە بەدرێـــژایی ڕۆژگـــار دەســـەڵات ( بێگانـــەو خـــۆیی ) دەوری بـــووە لەبەســـەرهات و مێـــژووی گـــەلی کـــورد ، لـــەم ماوەیـــەدا زۆر دوور نارۆم لەسەدەی شازدەمەوە دەست پێدەکەم ،

لەســـاڵی ١٥١٤ لـــەدوای جـــەنگی چـــاڵدێران بۆیەکـــەمین جـــار کوردســـتان بـــوو بـــە دووان ، پەیـــدابوونی دەوڵـــەتی ســـەفەوی موســـوڵمانی شـــیعە لـــەئێران لـــە ڕۆژهـــەڵاتی زاگـــرۆس و بـــەهێز بـــوونی دەوڵـــەتی عوسمـــانی موســـوڵمانی ســـوننە لـــەڕۆژئاوای

زاگـرۆس کارەسـاتێکی گـەورەبوو لەمێـژووی میللـەتی کـوردا، ئەو سنورەی لـەڕوباری ئاراسـی قەفقاسـەوە دەسـت پـێ دەکـا تـا کەنـداو تەمـەنی چوارسەدسـاڵە ، کـوردی ئـەم خاکـە لـەم مـاوە دوورو درێـژەدا لـەژێر ئەشـکەنجەو ئـازاری دەسـەڵات دەتلێتـەوە ، لەوکاتـەوە تـا ئێسـتا سیاسـەتی ئـیران بەرامبـەر بـەکورد گـۆڕانێکی ئـەوتۆی تێـدا نـەبووە لەسـەفەوی و قاجـارو پەهلـەوی یـەوە تـا خومـەینی ، دەسـەڵات گورگێکـە لـە گورگـەکان لـەدوای جـەنگی یەکـەمی گـێتی کوردسـتانەکەی ڕۆژئـاوای زاگـرۆس ( کوردسـتانی عوسمـانی ) شـەق و پـەق کـرا ، ئـازاری کـورد لەهـەموویان زیـاتربوو ، هەرچـۆنێ بـێ ئێمـە تـەنگو چـەڵەمەیەکی ئـەوتۆمان لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانی نـەبوو ، لەگـەڵ دەسـەڵاتی کەمالیـەکان کەوتینـە نـاو بیرێکـی بـێ بنـەوە ، واتـە دەسـەڵاتی لـەناوبردنی کـورد لەدەوڵـەتی تـازەی تورکیـا دەست پێ دەکا

ئەمـەش یـەکێکی دیکەیـە لـە گورگـەکان ، لـە ئێـران سیاسـەتی ڕەزاشای پەهلەوی بەرانبـەر بـە کـورد هـەر ئەوسیاسـەتە بـوو کـە سـەفەوییەکان دایانڕشـتبوو ، سیاسـەتی موسـوڵمانی شـیعە بەرانبـەر بـە کـوردی ئێـران دژوارتـر بـوو لەسیاسـەتی دەسـەڵات بەرانبـەر پارچـەکانی دیکـەی کوردسـتان ، چـونکە کـەوتبووە

ژێربـاری دوو دیـاردەی یـەکجار قـورس ، هەڵوێسـتی شـیعە بەرانبـەر بـەکوردی سـوننە ، ئینجـا مەسـەلەی قـەومی کـە نەتەوەیـەکی سـەربەخۆیەو فارسـی نـی یـە ، بەتایبـەتی ئێسـتاش کورد لە ئێـران زیـاتر لەبـەر ئـەوە دەچەوسێنرێتەوە کـە سوننەیە نەك لەبەر ئەوەی کە کوردە ،

لـەدوای ڕوخـانی دەوڵـەتی عوسمـانی میللـەتی عـەرەب دەسـت بەسـەربوو ، گیروگـرفتی نـاوەوەی زۆربـوو ، تـادوای جـەنگی دووەمـی گێتـیش ئـەو کاریگەریـەی لەسیاسـەت و دیپلۆماسییەتی دنیـا نـەبوو ، چـونکە سـەربەخۆیی تـەواوی نـەبوو بـەناوی نێودەوڵەتیـەوە تاپەیـدابوونی جـەمال عەبدولناسـر (١٩٥٣) ، ڕوو بـەڕوو بوونـەوەی کـورد لەگـەڵ عـەرەب لـەوەوە دەسـت پـێ دەکـا لـەعێراق و سـوریا ، بەتـەعبیرێکی دیکـە لەوکاتـەوە کـە عـەرەب سـەربەخۆیی دەسـت خسـت لەئـەنجامی بـەهێزبوونی بۆرجـوازی نیشـتمانی لەکۆمـەڵی دا ، ئـیتر وابـوو لـەعێراق و سـوریا گـەلێ کاربەدەسـت و بەڕێوەبـەری دەوڵـەت پەیـدابوون وەکـو عەبدولکـەریم قاسـم و عەبدولسـەلام عـارف و ئەحمـەد حەسـەن بـەکرو سـەدام حوسـێن و هـی دیکـە ، لەگـەڵ جیـاوازی هەڵوێسـت و کـردەوەی ئەمانـە لەیـەکتری بـەلام هـەموویان بەهـەر جۆرێـك بـێ دوژمنایـەتی

کوردیان کردووە ، ئەم دەسەلاتانەش هەندێ لە گورگانی ئەم ( گورگنامەیەن ) ،

( ٥ )

گورگی گەورە لەمێژووی میللەتی کوردا لەرۆژگارانی دواسالانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم یاراستر لەدەورو بەری جەنگی یەکەمی ئەمپریالیستی ئەورووپا ( ١٩١٤- ١٩١٨ ) بوو : بەریتانیا ، فەرەنسا ، ڕووسیا ، لەدوای جەنگی دووەم ( ١٩٣٩ - ١٩٤٥) ئەمریکا جلەوی سیاسەتەکەی گرتە دەستی خۆی ، بەریتانیا بەزۆری لەکوردستانی باشوورو فەرەنساو ڕووسیا لەکوردستانی باکور دەوری گرنگیان هەبوو ، دەسەلاتیان گورگانەبوو بەرانبەر بەکورد ، ژێرکەوتنەکانی کورد زیاتر لەبەر ئەوەبوو چونکە دیپلۆماسییەتی لەپلەی ئەوان نەبوو بۆئەوەی بتوانێ چاکەو بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ چاکەو بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی ئەم دەوڵەتە ئیستیعمارییە بەهێزانە بگونجێنێ ، بە پێی زروفێکی تایبەتی و دیاریکراو لەبەشێکی کەم لەکوردستانی عیراق ( دەسەلات ) پەیدابوو، ئەم دەسەلاتەش لەڕەوشتی گورگانە رزگاری نەبووە ، بەلام ناکرێ ئەم هەموو گورگانە: ئیستیعماری ئەورووپا ، هاوسێ دەسەلاتدارەکان ، گورگی

خۆمـالّی ، هـەموویان بەچـاوێك تەماشـا بکـرێن ، بـەلاّم نەگاتـە ئـەوەی گـورگی لای خۆمـان بـاش بـیّ و ئـەوەی بێگانـە خـەراپ بـیّ ، لـەم دواییـەدا لەرۆژنامـەو گۆوارەکانـدا هەنـدێ کـەس بەنیـەتێکی سـاکارو خاوێنـەوە کوردایـەتی دەکـەن و دەڵـێن : دەسـەلاّتی خۆمـان ئەگـەر خەراپـەش بکـا هـەر باشـەو دەبـیّ بـیّ دەنـگ بـین ، ئەمـە لەنـەریت و ئـەخلاقی تاکـە کـەس و کۆمەڵیش بەدوورە ،

حاجی قادری بلیمەت و داناو ستراتیج دەڵێ :

گەرهیچ نەبیّ بە ئۆین تابیع بەدەولّەتیّ بن

بێگانە چاکە دوژمن نەك دوژمنی لەخۆتان

منـیش دەڵـێم : کـاکی خوێنـەر مـن و تـۆ ئەگـەر خوانەخواسـتە خزمێکمـان یـان برادەرێکمـان زلـلـەیێکمان لـیّ بـدا لەسـەر دڵمان گرانتر نـابیّ ئەگـەر ئـەم کـارە لـە دوژمنێکمـان ڕووبـدا ؟!

گلەیی لەخۆیی زیاتر دەبیّ لە بێگانە ،

( ٦ )

نـەجات ئەسـپیندارەیی هەنـدێ لـەو سەرچـاوە مێـژوویی و ئەفسـانەیی و واقیعـی و حیکایـەتی بـەرگوێی ئـاگردانی بـەکار هێنـاوە بـۆ ئـەم کـارەی ، ئەوانـەی دەسـکاری کـردووە و مانـای تـازەی بۆیـان دروسـت کـردووە ، خوێنـەری کـورد دەتـوانیّ تـا

پلـەیێك ئـەو دەسـەلاَتانە بناسـێتەوە کـە فـەرمانڕەوایی کوردیـان کـردووە هـیچ نـەبێ لەوچوارسـەد سـالّەی دوایـی کـە هـەردوو سـەلّتەنەتی عوسمـانی سـونی و شاهنشـاهیەتی فارسـی شـیعی فـەرمانڕەوایی کۆمـەلّی کـوردو نێوەنـدی کوردەوارییـان کـردووە ، ئـەوجا لەسـەدەی بیسـتەمدا ئەمپریالیسـتەکانی ئـەورووپاو ولاتەیـەکگرتووەکانی ئـەمریکاو هاوسـێیانی کـورد لـەتورك و عەجـەم و عـەرەب ، ئینجـا تـاڕادەییێکیش دەسـەلاَتی کورد ،

نـەجات ئەسـپیندارەیی لـە ( گورگنامـە ) دا دەوری بـۆ شـوان دانـەناوە ، چـونکە شـوانی عادیـل نـی یـە ، شـوانی درۆ هەیـە ئـەویش گورگـە ، وەك ڕەمزێـك سـیفەتی بـۆ ئـەو دەسـەلاَتانە (گورگانـە) دانـاوە ، هەنـدێکیان زوو دەناسـرێنەوە ، هەنـدێکی دیکـەیان هـەموو کەسـێك نایاندۆزنـەوە ، بـەلاَم ئـەوەش هەیـە برێـك لـەو گورگانـە خـەلّکی دیـاری کـراوبن لەلایـەن کەسـانێکەوە ، کەچـی لـەلای خـەلّکی دیکـە ئەوانـە نـەبن و وێنـەیان لـەناو کەسـانی تـر ببینـرێ ، بێگومـان ڕێـك دەکـەوێ هـەردوو بیـنین ڕاسـت بـن ، ئەمـە یەکێکـە لەئـەدگارەکانی بەرهـەمی ئـەدەبی سـیمبۆلیزم بەتایبـەتی شـێوازی ئەفسـانەیی و حیکایـەتی بـەرگوێی ئـاگردانی تێکـەلّ بـووبێ ، گورگـەکانی

(گورگنامــه) ی نــەجات بــەم جــۆرە ناویــان لەچــیرۆکە شــیعری یەکــەدا هــاتووە : گــورگی کێــوی ، گــورگی برســی ، گــورگی پــیر ، گــورگی بیابــان ، گــورگی ڕەش ، گورگــە بــۆر ، گــورگی پێپەتی ، گورگی گەورە ، گورگی زۆزانان ، دوو گورگ ( ســــەفەوی و عوســــــانی ، دوو حیزبـــــی دژ بەیــــەکتری ) ، گورگی خۆماڵی ، گورگی خۆمانەو هی دیکە ،

## ( ٧ )

گورگنامــــە لــــەڕووی روخســــاری ئەدەبیــــەوە ئــــەم ســــیفەتانە دەگرێتە خۆی ،

١- لەســـــەر بنچـــینەی چـــوارین ( روبـــاعی ، دوو بـــەیت ) دانراوە ، کێشـی سیلابی خۆمـاڵی یـە ، لـەدە کـەرت پێکهـاتووە ، بەزۆری وەستان لەناوەڕاستی نیوە دێڕ شیعر دایە ( ٥+٥ )

٢- قافیـــەی تـــازە بابەتـــە ، لـــە ئـــەدەبی کلاســیکی کـــوردی نووســراو و ئــەدەبی میللــی نەنووســراو ( فۆلکلــۆر ) ئــەم جــۆرە قافیەیە کەمە ( اب ح ب )

٣- فەرهــەنگ و زاراوەو لێکســیکۆنی شــیعرەکە دەوڵەمەنــدە ، زیــاتر بــەلای فەرهــەنگی ئــەدەبی میللــی و قســەکردنی نــاو

خەڵك دەشكێتەوە ، ئەگەر لەهەندێ جێگەدا مانا داخراو بێ و تێگەیشتنی قورس بێ لەبەر ئەوەیە چونكە بەشێوازێكی سیمبۆلی و رۆمانتیكی بیر لەدارشتنی رستەكانی كراوە ، گومانم لەوەدانی یە ئەم بەرهەمە ئەدەبی یە جێگەی خۆی لەناو دڵ و دەروونی خوێنەرو خوێندەواری كورد دەكاتەوە.

سەركەوتن بۆ خاوەنی دەخوازم

هەولێر : مەڵبەندی ڕووناكی
٢١ ی تەموزی ٢٠٠٨
د. مارف خەزنەدار

گەلێك شوان هەن لەترسی گورگ
تفەنگ هەڵدەگرن بۆ پاسەوانی
بەلاّم گەر شوان خۆی بوو بەگورگ
بۆكێ تفەنگی بكاتە شانی ؟

★ ★ ★

گەلێك شوان هەن كە دەیانەوێ
بمكەن بەگۆچان بۆدەستی خۆیان
لەجیاتی ئەوەی گورگ ڕاو بنێم
سەری ئەم و ئەو بشكێنم بۆیان

★ ★ ★

تۆ كە پێڵاوت لەپێستی مەڕە
بۆشوانی مێگەل هەرگیز دەست نادەی
بەگیانێكەوە وەك گیانی گورگ
دەتەوێ هەردەم ڕەنجمان بە بادەی

★ ★ ★

ئـــەمڕۆ شـــوان دەبـــێ زۆر بەدیقـــەت بـــێ
چـــونکە گورگـــەکان گـــەلێك فێـــڵ زانـــن
بـــــە ڕۆژی روونـــــاك بـــــەرخ دەدزن و
خـــــۆ دزەکـــــانیش هـــــەر لـــــەخۆمانن

★ ★ ★

خـــەڵکی پـــێم دەڵـــێن تـــۆ بـــێ شمشـــێری
گـــورگ لەبـــەرتۆ جـــا چـــۆن ڕادەکـــا
مـــن شـــوانم دیـــوە شمشـــێری پـــێ یـــەو
گـــورگیش لـــەدەورەی وا ســـەما دەکـــا

★ ★ ★

ئـــاگر لەجەســـتەی بـــێ گیـــانم بـــەردەن
بـــەم پشـــکۆیانە گـــەرم نابمـــەوە
لـــەناو گورگانـــدا دڵـــم ڕەق بـــووە
بەنمـــەی بـــاران نـــەرم نابمـــەوە

★ ★ ★

ئای چ ڕۆژێکی پڕ لەمەینەتە
گورگ لەگەڵ شوان لەسەر یەك خوانن
کاسەو فنجانەی خوێن فڕدەکەن و
لەکاسە لێسی پێکەوە جوانن

★ ★ ★

ئەوگوڵەی کەوا بەخوێن گەورەبوو
دەستی لێ مەدەن هێشتا ساوایە
بەلاّم گەر گورگ شیلەکەی بمژێ
گەورەتر دەبێ سروشتی وایە

★ ★ ★

ئەوەندە خوێن دێ لەبرینەکەم
ڕەنگە چەند گورگێك لەزامم تێربێ
کەوتوومە نێوان دوو گورگی برسی
دوعام بۆ بکەن ئاخیرم خێربێ

★ ★ ★

جاران لەکەڵبەی گورگ دەترسام
بەلاّم ئێستاکە لەگۆچانی شوان
لەکوێ کیشوەرێك بدۆزینەوە
پڕبێ لە بزەو پێکەنینی جوان

★ ★ ★

بەدیار سیس بوونی گوڵی ئاواتم
هەورێ لەچاوما باران دائەکا
شەوان لەخەوما دڵە ڕاوکەمەو
گورگ بەرەو ڕووم دێت و ڕائەکا

★ ★ ★

تەواو دڵنیام کە ئەم گورگانە
دەمیان سوربووە بەخوێنی ئێمە
ئەوەی تادوێنێ گوڵی یەخەم بوو
ئەمڕۆ هەمیشە دڕکی ژێر پێمە

★ ★ ★

شـــوانی ئـــەم گونـــدە بەکـــەوڵی گـــورگ
خۆنمـــــایش دەکـــا ئولفــــەتی وایـــــە
قــــــوولآیی ســـــــینەم گۆڕســـــــتانێکە
تــــەرمی هــــەزاران خــــەونی تێدایـــــە

★ ★ ★

دڵ غافـــڵ نـــابێ لـــەو ڕانـــە مـــەڕەی
گۆچـــــانێك نیـــــە گلیـــــان داتــــــەوە
هەمیشــــــە بـــــیرم لای ئەوشــــــوانەیە
کـــە لەگـــەڵ گورگـــا خـــوێن دەخواتـــەوە

★ ★ ★

هـــەتا مـــەڕ بـــوون و کەڵبـــەتان نـــەبوو
نەتانـــــــدەزانی چـــــۆن بلـــــوورێنن
بـــــەلآم ئێســــتا وەك گـــورگی زەبـــەلاح
بـــەهیچ تێرنـــابن هـــەر تێنـــووی خـــوێنن

★ ★ ★

بـــاوەڕێکی قـــووڵ هەســـتێکی ناســـك
هـــەرگیز دیارنیـــە لەســـیمای تـــۆدا
دەبـــێ لـــەگورگ ڕەشـــتربێ بـــەختم
کـــە خۆرخنکـــاوە لـــەنێو ئاســـۆدا

★ ★ ★

شـــەوان بـــەجلی حـــەڕبی دەخـــەوم و
نێزەوخەنجـــەرم لـــەژێر ســـەرینە
بـــەخوا ئـــارامی بەچـــاو نـــابینم
تـــا گـــورگ مـــابێ لـــەم ســـەر زەمینـــە

★ ★ ★

هـــەڵۆی بـــەرزەفڕ بـــەداو نـــاگیرێ و
هـــەرگیز فڕوفێـــڵ کـــاری تێناکـــا
وەك گـــورگ و ڕێـــوی و قەلـــەڕەش نیـــە
بـــەدوای کـــەلاکی تۆپیـــودا ڕاکـــا

★ ★ ★

نەمانـــــدەزانی دڵـــــی ئـــــەم شـــــوانە
کانیلەیـــــەکی وشـــــك و بـــــێ ئـــــاوە
نـــە ســـۆزی تیایـــەو نـــە خۆشەویستـــی
لـــــەناخا گورگــــەو ئـــــادەمی نـــــاوە

★ ★ ★

کـــــرم لـــــەناخی ئـــــەم دارە دایـــــە
بۆیـــــە ڕوخســـــاری زەرد هەڵگـــــەراوە
کـــرمیش وەك گـــورگ لەســـەر خـــوێن دەژی
خـــوێن بـــۆ خوێنمـــژان وەك نـــان و ئـــاوە

★ ★ ★

ڕەشـــــەبایەکی سەرســـــەخت و بـــــەهێز
ئـــەم مێگەلـــەی کـــرد بـــەدوو بەشـــەوە
گـــورگ ئەوەنـــدەی پەرێشـــان کـــردوون
زامیـــــان دیـــــارە بەســـــەر لەشـــــەوە

★ ★ ★

بەهەمەموو دیاردەو نیشانەکانا
مێشکی تۆ پڕە لەهزری بەتاڵ
تۆ شیری مەمکی گورگت خواردووە
ئیتر فڕێدە قاپوت و گۆپاڵ

★ ★ ★

لەگۆمی مەنگی چاوەکانتەوە
نیگەرانیەکی خەمناك دەبینم
منیش وەکو تۆ دڵ پەشۆکاوم و
گورگ کەوتۆتە کەناری ژینم

★ ★ ★

لەگەڵ گریان و هەنسکی تۆدا
باڵندەکانیش مات و غەمبارن
ئەوانیش لەگەڵ هاتنی گورگ
لەلانەو زێدی خۆیان بێزارن

★ ★ ★

ئەم شوانە مەستی خەوێکی قووڵە
ئاگای لێ نیە رۆژە یان شەوە
چۆن لوورەی گورگ بێزارم دەکا
وەهاش دڵ تەنگم بەو پرخەی خەوە

★ ★ ★

کە شەوداهات و ڕوناکی نەما
درەختەکانیش سێبەر ون دەکەن
گورگەکان خێرا دێنە دەرەوە
دەڵێی سۆراغی سەری من دەکەن

★ ★ ★

خۆمن خەونێکی زۆرجوانم هەبوو
کە تاکە خەون و ئومێدی من بوو
بەلام لەچەرخی گورگ گورگانێ
لەنێو رۆژگاری سپڵەدا ون بوو

★ ★ ★

جێ کەڵبەی گورگم وا لێ پیس بووە
خوێن بەچۆڕاوگە دەڕوا لەبەرم
عومریشم دیلی دەستی کەسێکە
لەهەرجێیەك بم دەگاتە سەرم

★ ★ ★

دەریاکان پڕن لەقولاب و داو
کەنارەکانیش لەتەرمی ماسی
دەبێ ڕووکەینە دارستانەکان
گەرلەوێش گورگ هەڵمان نەواسی

★ ★ ★

زۆرچاك دەزانم کەئەم گورگانە
دەمیان دەجولێ لەنێو برینم
بۆیە هەمیشە شەقارشەقارن و
یەکناگرنەوە تامابێ ژینم

★ ★ ★

سەرت مەخە سەر سەرینی نەرم
لووورەی گورگ دێ لەم نزیکانە
شوان دەبێ شمشێر بکاتە سەرین
نەك باسك و قۆڵی کام ئافرەت جوانە

★ ★ ★

گەر بەزیندوویش گورگ نەتخوا
کە مردی لەنێو گۆڕی تەنگ و تار
گۆشتت دەبێتە خۆراکی کرم و
لاشەت پڕدەبێ لە دووپشك و مار

★ ★ ★

لەلام ببوونە سوپای ئەبرەهە
ئەوگورگانەی کە ناگەڕێنەوە
گەرخودا بەردە بارانیان نەکا
دەمان گەوزێنن لەنێو خوێنەوە

★ ★ ★

کە بیر لەگورگ و شوان دەکەمەوە
پەلکێشم دەکا یادی منداڵی
یادێك لەناخما چەخماخە دەدا
زۆر بەسۆزترە لەشیعری ناڵی

★ ★ ★

کاغەزو خامەش لێمان بێزارن
چونکە نازانین بەکاریان بێنین
لەجیاتی ئەوەی دەستمان ڕەنگین بێ
هەر وەکو گورگ پەنجە بەخوێنین

★ ★ ★

لەگەڵ کازیوە پێکەوە هاتین
بەئێمە زەوی ئاوەدان بۆوە
کە وردە وردە گورگ پەیدابوو
کەڕامەت نەماو بۆ ئاسمان چۆوە

★ ★ ★

ئاگر لەهەستی ناسکم بەرمەدە

تۆ قسەکانت وەك ژیلەمۆیە

زامی سەرجەستەم جێ کەڵبەی گورگە

بەڵام زامی دڵ جێی تیری تۆیە

★ ★ ★

کەس نەیدەزانی ئەو زەماوەندە

ئەوەندە پڕی کێشەو فیتنەیە

هەموو برینێك کە لە لەشمابێ

جێ ڕنەی گورگی بەسەرەوەیە

★ ★ ★

تا شمشێرەکان نەچنەوە کالان

ئەم زامە قووڵە هەر ساڕێژ نابێ

شمشێر بۆ گورگە نەك بۆمن و تۆ

دەبێ ڕۆژگاری بێ شمشێر دابێ ؟

★ ★ ★

لەو ڕۆژەی قابیل کە هابیلی کوشت
خەڵك بەدەستی گورگەوە دیلە
بەرەچەڵەکی دۆنای دۆنەوە
دیارە کە گورگ نەوەی قابیلە

★ ★ ★

نە دوێنێی خۆمم باش لەبیرماوە
نە دەشزانم کە ئایندەم چییە
ئەوەندە بیرم لەلای گورگانە
ئۆقرەو ئارامی جارانم نییە

★ ★ ★

بەردیش سێبەری گورگی لەسەربێ
لەداخان وەکو خەڵووز ڕەش دەبێ
گوڵزارێك گورگ تێیدا بگەوزێ
چۆن خونچەکانی جوان و گەش دەبێ ؟

★ ★ ★

لەنێو تارمایی و تاریکە شەودا
سەگت لێ بووە بەگورگی کێوی
شوانی جەربەزە نابێ غافڵ بێ
لەخشپەخشپی پێی گورگ و ڕێوی

★ ★ ★

خەم و مەینەتی ڕێچکەی بەستووە
لەدەرگای دڵم دێنە ژوورەوە
خەمی ئەم گورگە بۆمن بەس نەبوو
تابورێکی تر هات لەدورەوە

★ ★ ★

خۆرم لێ بووە بەچرا ڕەشکەو
فرسەخێك دەورو پشتم نابینم
هەتا گورگ لەم هەوارگە مابێ
هەردەبێ زام و ئەشك بێ ژینم

★ ★ ★

خەمت لەدڵما زامێکی قووڵەو
وەك پشکۆ هەردەم دەگەشێتەوە
تۆ چ شوانێکی مەست و بێ ئاگای
گورگ وەك سێبەر لکاوە پێتەوە

★ ★ ★

کە مانگی چواردە کەوتە پەناوە
بە حەپەی سەگێك لەخەو هەڵدەستم
دەزانم گورگ لەدەورو بەرمەو
نابێ تەنها پشت بەسەگ ببەستم

★ ★ ★

من لەگەڵ تۆدا هەرگیز تەبا نیم
کەتۆ جیاوازی گورگ و سەگ ناکەی
سەگی بەوەفا لەشوان باشترە
هۆبەو ڕەشماڵت بێ سەگ بن تاکەی ؟

★ ★ ★

لەپشـــــت پەنجـــــەرەی داخـــــراوەوە

پرخـــەی خـــەوی دێـــت بـــە ڕۆژو بەشـــەو

لــــە ڕۆژگارێکـــــا کــــەگورگ هــــەبێ

ئاخرچـــاوی شـــوان چـــۆن دەچـــێتە خـــەو

★ ★ ★

دڵــــم تامـــــەزرۆی ئــــەو ئاوازەیــــــە

لەگــــــەرووی شمشـــــاڵ دێتـــــە دەرەوە

بـــــەلوورەی گــــورگ ســـــەرم کــــاس بــــووە

ئــــای بـــــۆ دەنگێکــــی هێــــور کــــەرەوە

★ ★ ★

پەناوپێچـــــی شــــــاخ باچــــاك بگـــــەڕێین

ڕەنگـــــە ئەوشـــوانە ئێســـــتا خــــــەوتبێ

باعــــــەباعی مـــــــەڕ دێتـــــە گوێمـــــەوە

پێدەچـــــێ گورگیــــان بــــەناو کـــــەوتبێ

★ ★ ★

لەنێو بڵێسەو گڕو دوکەڵدا
ڕوخسارم نوقمی تۆزو غوبارە
دڵم هەرلەلای ئەو گورگانەیە
کە دەیانەوێ بمخۆن دوبارە

★ ★ ★

لەفڕوفێڵت چاك شارەزا بووم
بەکراسی سپی خۆم نیشان مەدە
ببیتە گوڵ و پەپوولەی پاکیش
تۆ هەرئەو گورگەی کە ناوت بەدە

★ ★ ★

باڵندەیەکی بێ پەڕوباڵ بوو
خستیانە بەردەم سەگی پاشاوە
جیاوازی گورگ و ئەم سەگە چیە
لەکاتێکا هەر گورگ بەدناوە

★ ★ ★

جگە لەتەقەی تفەنگی ڕاوچی
نە قاسپەی کەو دێ نە شمشاڵی شوان
دەشت و کێو هەمووی گورگ و بەرازە
کوا شوێنی دلگیر کوا دیمەنی جوان

★ ★ ★

لەو ڕۆژەی کە تۆ بووی بەشوانی دێ
دەرگا لەگورگ خرایە سەرپشت
تەرمی ئەوانەم دێتەوە بەرچاو
کە بۆمن و تۆ خوێنی خۆیان ڕشت

★ ★ ★

لەبن بەردێکام گوێم ڕاگرتووە
لەگۆرانیەکی زۆر خەمگینەوە
گۆرانی شوانێك کە هیلاك بووەو
بێزارە لەدەست گورگی شینەوە

★ ★ ★

کەبـــەختی ڕەشـــی کـــوردم خوێنـــدەوە

گـــــورگ نووســــــرابوو لەنێوچـــــاوانی

بۆیـــە شمشـــێرو خەنجـــەرو قـــەلغان

هەمیشـــــە بۆتـــــە چـــەکی سەرشـــانی

★ ★ ★

خۆزگـــە دەمتـــوانی لـــەم چـــەرخە ســـپڵە

بـــــێ سەرپەرشـــــتان بگرمـــــە ئـــــامێز

لـــــەگورگی برســـــی بیـــــان پـــــارێزم و

ببمـــــە قـــــەلغانێك بۆپیـــــاوی بـــــێ هێـــــز

★ ★ ★

بـــۆ ئەوکۆرپەیـــەی کـــە بـــێ ئـــامێزە

دڵـــــم هەرلـــــەلای ئەشـــــکەکانێتی

لەومناڵانـــــەی بـــــێ سەرپەرشـــــتن

خەریکـــــە پڕبـــــێ ســـــەرتاپای گـــــێتی

★ ★ ★

خۆزگــەم بەوماســییەی کەژینگــەی پاکــەو
قـــــوولاّیی دەریـــــا نیشـــــتمانیەتی
نـــە گـــورگی دیـــوەو نـــە ڕێـــوی فێڵبـــاز
سروشـــتی ژێرئـــاو جێـــی پەنهانیـــەتی

★ ★ ★

ئـــەرێ شـــوانەکە بۆچـــی هەڵناســـی
ئـــەم خـــەوە چـــیە دەســـتەمۆی کـــردووی
خەریکـــە گـــورگ بـــازدەن بەســـەرتا
تـــۆش زیندوویـــەکی لـــەناخا مـــردووی

★ ★ ★

بـــەدوای تریفـــەی مانگـــدا دەگـــەڕام
کەچـــی کەوتمـــەژێر بـــاڵی هـــەورەوە
نـــە مـــانگ دیـــارەو نـــە ئەســـتێرەیەك
پـــێم کەوتـــە داوی گـــورگی گـــەورەوە

★ ★ ★

شـــــوانه پیرەکـــــه جارجـــــاره دەیگـــــووت
گۆچـــــانی دەســـــتم عەســـــای موســـــایه
دەبێتـــــه عـــــەزیاو گورگـــــەکان دەخـــــوا
بۆهـــــەژارانیش دەبێتـــــه ســـــایه

★ ★ ★

هـــەرگیز ســـڵ ناكـــەم لـــەلوورەی گـــورگ
مەینـــەتی گـــورگم چـــونکە زۆر دیـــوە
ئـــۆقرەو ئـــارامی لـــێ بڕیـــوم خـــەم
وەكـــو كـــوورەی هـــەنگ دڵمـــی تـــەنیوە

★ ★ ★

وەكـــــو گەڵایـــــەك زەرد هەڵگـــــەڕابێ
بـــه كـــزە بایـــەك مـــن هەڵـــدەوەرم
لەترســـی گـــورگ و مەینـــەتی ڕۆژگـــار
بـــەفری ڕێبەنـــدان زوو كەوتـــه ســـەرم

★ ★ ★

لەئەشـــــکەوتێکا دانیشـــــتووم بـــــەدیار
بـــــــــەفرباریی بـــــــــەفرانبارەوە
بـــەفر دەبـــارێ و لـــوورەی گـــورگ دێ
چـــۆلەکەش دیـــــارنین بەســـــەر دارەوە

★ ★ ★

لەئەشـــکەوتێکام هـــیچ کـــەس نـــامبینێ
ڕووم وەرگێـــــــــڕاوە لــــــــەئاوەدانی
خـــۆ گـــورگی دوو پـــێ دڕنـــــدەترە
لـــــە ورچ و شـــــێرو هاوشـــــێوەکانی

★ ★ ★

وەکـــو دێوانـــــە ڕوو دەکەمـــــە چـــیا
چـــیا خـــــەڵوەتگاو ســـێبوری گیانـــــە
مـــادام دنیامـــان هـــەمووی گـــورگ بـــێ
خـــۆ گـــورگی چـــوار پـــێ باشـــترینیانە

★ ★ ★

ڕێچکەگەلێك هەن لەپاڵ ڕێگادا
گورگ لەسەریان پۆل پۆل وەستاون
ئەوانەی وێڵن بەو ڕێچکانەدا
چاوساغی خەڵکن بەڵام بێ چاون

★ ★ ★

با بەتەنهایی ڕێ نەگرینە بەر
تەنهایی تەنها بۆ خودا چاکە
ڕێبواری ڕێگا گەر هاوڕێی هەبێ
لەگورگ و ڕێوی و دەعبا بێ باکە

★ ★ ★

دەبا قاوەیەك پێکەوە فڕکەین
بەرلەوەی لەیەك جیابینەوە
هەردوکمان بەدەست گورگ دەناڵین
گورگ ئاشوبی خستە ژینەوە

★ ★ ★

ڕاوچـــی بـــێ مـــروەت لـــەنێو دارســـتان
داو بۆباڵنـــــــــــدان دادەنێنـــــــــەوە
لەلایـــەك گورگـــەو لەلایـــەك ڕاوچـــی
بۆیـــە ژیـــن بۆتـــە گـــۆمێ خوێنـــەوە

★ ★ ★

گـــورگ ئەوەنـــدەی کەڵبـــە لێـــداوم
تـــك تـــك خـــوێن دەتکـــێ لەزامـــەکانم
پێڵاوەکـــانم پـــڕی خـــوێن بـــووە
بۆیـــــە لـــــەرزۆکن ئەندامـــــەکانم

★ ★ ★

برینـــــەکانم قـــــەتماغ نـــــاگرن و
ســـارێژ نابنـــەوە هـــەتا لـــەژیانم
دەبـــێ هانـــا بـــۆ حـــەکیمێك بـــەرم
کـــە ژەهـــری گـــورگ دەرکـــا لـــەگیانم

★ ★ ★

لـــــه ململانێـــــی گـــــورگی کێـــــوی دا
تەمـــــەنی گـــــەنجیم ڕۆیـــــی بـــــەبادا
ئێســـــتاش پیربـــــووم و وزەم نـــــەماوە
گـــــورگی خۆمانـــــە یەخـــــەم بـــــەرنادا

★ ★ ★

ئەوخوێنـــــە گەشـــــەی لـــــەزامم دەتكـــــێ
زەوی قووتیـــــدا وەك گـــــورگی برســـــی
چـــــرای ئومێـــــدم كوژاوەتـــــەوەو
لـــــەو خامۆشـــــی یـــــەم كەسێك نەیپرسـی

★ ★ ★

پێـــــی نـــــاوێ ئـــــیتر خـــــۆ بپـــــارێزین
لەهـــــەر جێیـــــەك بـــــین گـــــورگ لـــــەوێ یـــــە
ئـــــەویش وەكـــــو هـــــەر دەعبایـــــەكی تـــــر
لەگـــــەڵ ئێمـــــەدا ڕێبـــــواری ڕێ یـــــە

★ ★ ★

بــــه عەســـــاو قــــاپوت فریومـــــان مـــەدە
قـــــاپوتی بـــــەرت كــــەوڵی گورگانـــــــە
هـــەر شـــوانێك مـــەیلی جنـــونی هـــەبێ
جانـــــــەوەرێكی زۆر بـــــــێ ئامانـــــــــە

★ ★ ★

لـــەداخی گـــورگ پەنجـــەی خـــۆم بـــڕی
ئەوەنـــدەی شمشـــێر بســـوم بـــە هەســـان
ئێســـتاش دەبیـــنن كـــە دەســـت بـــەتاڵم
شمشـــــێر كەوتۆتـــــە دەســـــتی ناكەســـــان

★ ★ ★

هـــەموومان ئـــەوە زۆرچـــاك دەزانـــین
كـــە گـــوڵی ئێمـــە كەوتۆتـــە دەســـت كـــێ
هـــەتا مەســـت دەبـــێ بـــۆنی دەكـــات و
ئینجـــا گورگانـــە دەیخاتـــە ژێـــر پـــێ

★ ★ ★

شـــەو ڕەشماڵێکـــە وەك چـــەتری گـــەردوون
ئــــــەم دارســـــــتانەی پـــــێ داپۆشـــــراوە
گـــورگ بـــــەدوای ئـــــەو مــــەڕەدا وێڵـــە
کــــــە لەمێگــــــەلی شــــوان بــــــەجێماوە

★ ★ ★

وەك یوســـــف لــــەنێو بیرێکـــــی قــــووڵ دام
هاوڕێکانیشــــــــم پــــــێم پێدەکـــــــــەنن
بەوەنــــــدەش دڵیـــــان ئــــاو ناخواتـــــەوە
گورگانــــــە دەم لــــــە زامــــــم دەژەنــــــن

★ ★ ★

کراســــــــی یوســــــف مەکەنـــــــە بـــــــەرم
بـــــەم ئــــۆین بازیــــە توخــــوا نـــــامرن ؟
تــــاوان دەخەنــــــە ئەســــتۆی گورگــــــەوە
کەچــــــــی لـــــــــەگورگ دڕنــــــــــدەترن

★ ★ ★

کـــام شمشـــێر هەیـــە کـــام دەســـت و بـــازوو
لـــە کۆشـــکی پاشـــا مـــەزاد نـــەکرابێ
کـــام شـــوان هەیـــە وەك گـــورگی برســـی
ســـەدان باڵنـــدەی بـــەدەم نـــەخورابێ

★ ★ ★

پـــەت و قـــەنارە هێنـــدە زۆر بـــووە
ئاگـــات لـــێ نـــەبێ ســـەرت تێدەچـــێ
گـــورگ یـــاری بـــە پەتـــەکان دەکـــا
ئـــاخۆ ئـــەو پەتـــە بـــۆملی کێدەچـــێ

★ ★ ★

ڕۆحـــی شـــوان لەگـــەڵ ڕۆحـــی گـــورگ دا
ئاوێتـــە بـــووە لـــەنێو یـــەك جەســـتە
شـوانیش وەك گـورگ گۆشـت و خـوێن دەخـوا
بۆیـــە بـــەخوێنی مـــن و تـــۆ مەســـتە

★ ★ ★

هەتا ڕۆح مابێ لەنێو جەستەما
مەترسی گورگ دەرناچێ لەدڵ
لەسایەی شوانێك كە هەردەم مەستە
دەبێ خەونەكان بنێمە ژێر گڵ

★ ★ ★

جارێك بە گورگ دەمانفرۆشن
جارێكیش بە مەڕ دەمانكڕنەوە
پڕبەدڵ حەزم لەتۆفانێكە
لەسەر ڕووی زەوی بمانسڕنەوە

★ ★ ★

خۆزگە دەخوازم زریانێك بێت و
سەرو پەرچەمی درەخت بتاشێ
درەختێك سێبەر بۆ گورگ بكا
بەروو بوومەكەی بۆ ئێمە ناشێ

★ ★ ★

پەڵەهـــــــەورەکان وا کۆبوونــــــــەوە
ئــاخۆ چـــەند نمێــك بارانیـــان پــێ بــێ
بــــەلاَم دڵنیــــام بـــاران نابـــاریٚ
لــەو جەنگەلاَنــەی کــە گورگیـــان لــێ بــێ

★ ★ ★

گومــــانم هەیــــە لـــەو دارســـــتانەی
باڵنـــــدەکانی ئــــــۆقرە نــــــاگرن
دەبـــێ بێـــزاربن لەدەســــتی گـــورگ ؟
یـــان هێلانـــەیان کـــوورەی ئـــاگرن

★ ★ ★

ئـــەم ڕەوە گورگـــە بـــەهیچ تێرنـــابن
دارســـتان نـــەما نەگـــەڕێن بـــۆ قـــووت
رۆژێکـــــیش دادێ دارســــــــتانەکەم
لـــەپڕ دەبێتـــە جەنگـــەڵێکی ڕووت

★ ★ ★

نێــــزەو خەنجــــەری هـــــەموو جــــەللادان
لـــــــەزامی منـــــدا پێـــــك دەگەنـــــــەوە
بـــــەو تیغـــــەی کـــــەبۆ گـــــورگ تیــــژکرا
ســــــەرم لەلاشـــــــە جـــــویَ دەکەنـــــــەوە

★ ★ ★

ئــــەم چــــەرخە چــــەرخی بــــەیت و بــــالۆرەو
ماســــــــتاوی ســــــــاردو پیــــــا هەڵدانـــــــــە
ئەگـــــەر شمشـــــێریش بســــوون لــــــەگورگ
دیســــــان هـــــــەر درۆی بـــــــەر ئاگردانــــــــە

★ ★ ★

تـــــــەمی مەینــــــەتیم کردۆتـــــــە بـــــــەرگ
شـــــــەوانە خـــــــۆمی پـــــــیَ دادەپۆشـــــــم
مـــــن هێنـــــدە ڕقـــــم لەچـــــارەی گورگـــــە
ئـــــەویش ســـــەری خـــــۆی کردۆتـــــە کۆشـــــم

★ ★ ★

لەگوڵــــە گـــەنمێك مـــن تێنـــوو تـــرم

بـــۆ بـــای شـــەماڵ و نم نمـــەی بـــاران

خۆشـــە لەچـــاوی گورگـــان بـــەدوربی و

مەســــــتانە بــــــزی لــــــەدەم كــــــەناران

★ ★ ★

نـــــە لەسروشـــــتا بــــزە دەبیـــــنم

نـــــە لەســــەر لێـــوی منـــــداڵی لادێ

ئــەم هەوارگەیـــە گونـــد بەگونـــد گـــەڕام

هـــەر لـــوورەی گـــورگ و گڤڤڤـــەی بـــا دێ

★ ★ ★

كـــــاتێ دەچـــــمەوە زێـــــدی منـــــاڵیم

یـــــادێكی خـــــەمناك بـــــەزەینم دادێ

یـــــادی ئـــــەورۆژەی گورگـــــە بۆرەكـــــان

لوورەیـــــان دەهـــــات لـــــەدوری لادێ

★ ★ ★

هەتاکەی دەبێ ئەو ڕانە مەڕە
لەسەدەی گورگان وا بێ سەروابێ
لەم سەردەمەدا مێگەلی بێ شوان
وەك ئەو شێعرەیە کە بێ سەروابێ

★ ★ ★

پیری زەنگێکی سامناك لێ دەدا
باوەشی گۆڕم بیردەخاتەوە
گورگ ئەوەندە سەرقاڵی کردم
نەیهێشت سودبکەم من لەکاتەوە

★ ★ ★

مەرگێکی ناکاو چاوەڕێم دەکا
نە ڕۆژی دیارەو نە ساتەوەختی
چارەنووسی من لەدەست گورگایەو
هەردەم لەجەنگام لەگەڵ بەدبەختی

★ ★ ★

ئەوەنـــــدە گـــەڕام بـــەدوای گورگـــدا
باســـك و تـــەلان و كـــەژوكێو نـــەما
بـــەنێو دڕك و داڵ گـــوزەرم دەكـــرد
لەشـــوێن پێكانمـــا خـــوێن بـــەجێ دەمـــا

★ ★ ★

لەچـــاوی منـــدا دنیـــا زۆر ڕەشـــە
ڕەنگـــەكانی تـــر ناخوێنێتـــەوە
هـــەموو وێنـــەكان وەك گـــورگ ڕەشـــن
ڕەش لـــە دیـــدەما دەبریســـكێتەوە

★ ★ ★

كـــاتێ دەمـــەوێ بـــەرەو خـــۆر بچـــم
گورگێـــك دەبیـــنم ســـەرەڕێ دەگـــرێ
بۆهـــەرلا بـــڕۆم دێتـــەوە پێشـــم
وەكـــو ئەهریمـــەن یەخـــەم پـــێ دەگـــرێ

★ ★ ★

بـــــاران كێڵگــــــەكان دەخوێنێتـــــــەوە
دەزانــــــێ كاميــــــان بەرەكــــــەت دارە
وەك بــــاران ســــەرم دەبەخشـــم بــــەخاك
نــەك وەك ئەوگورگــەی خــاك لێــی بێــزارە

★ ★ ★

هەرچـــــوار قـــــوژبنی دنيــــا بگـــــەڕێی
دڕنــــــدەی وەك ئـــــەو گورگانــــــە كـــــەمن
گيـــانی شـــەڕانگێز هـــــەر لــــەخۆيان دێ
بـــــۆ ئاينـــــدەشمان هەميشــــــە خــــــەمن

★ ★ ★

وەك باوكـــــە ئـــــادەم كەوتمــــە غوربــــەتی و
دنيـــــای بـــــێ وەفـــــا بــــــەمن نامۆيــــــە
لەگــــــەڵ گورگــــــدا هــــــەردەم لەجــــەنگم
پيـــاوی نـــاو جـــەنگيش هـــەر ڕەنجەڕۆيـــە

★ ★ ★

دڵنیام لەوەی کە سەگی برسی
وەکو گورگی هار پەلامار نادا
سەگی بەوەفا لە غەفڵەتیشا
خاوەنەکەی خۆی قەت ئازار نادا

★ ★ ★

ئەو ڕەشەبایە هێندە بەهێزە
کاتێ هەڵدەکا گوڵ دەژاکێنێ
گوڵیش وەکو مەڕ شپرزە دەبێ
کاتێ کە گورگ دەمی بۆ دێنێ

★ ★ ★

گەردەلوولێکی هێندە سەخت بووی
سەدان باڵندەت بێ هێلانە کرد
گورگ ئاسا بووی لەپەلاماردان
مێگەلت وێڵی ئەو کەژانە کرد

★ ★ ★

لەژێر تارمایی باڵی هەورەوە
خەریکە ڕێگای خۆم لێ ون دەبێ
ڕێگایەك بەنێو گورگاندا بڕوات
مەترسی یەکەی هەر بۆمن دەبێ

★ ★ ★

چلەی زستانەو کێوە بەرزەکان
سەریان بزربوو لەنێو هەورەوە
گورگ ناوێرێ سەری دەربێنێ
بەرانبەر پیاوی ئازاو بەورەوە

★ ★ ★

چەخماخەی هەور بروسکە داوێ و
جارجار ڕوناکی دەداتە بەرپێم
ئەو ڕوناکی یە بۆ ئەوە باشە
دەزانم گورگ چەند نزیکە لێم

★ ★ ★

لەجیاتی بزەو خەندەو پێکەنین

قووڵایی ناخم پڕە لەگریان

کاتێ ڕوخساری گورگ دەبینم

لەداخان دڵم دەبێ بە بریان

★ ★ ★

بەقەد قورسایی ئەو کەژوکێوە

ئەرکم گرانەو خەم لەدڵم بارە

لەنێوان گورگ و حەپەحەپی سەگ

خواردن وخەوم وەك ژەهری مارە

★ ★ ★

وەرن سەیرکەن ئەم دارستانە

گورگ هێلانەی تیا کردووە

شوانیش لەپرخە پرخی خەودایە

بێ ئاگا دەڵێی تەرمی مردووە

★ ★ ★

ئێوارەیەکی دەمەو پایزەو
گورگ حەزدەکا کە زوو شەودابێ
بێ ترس بخزێ بۆناو مێگەل و
شوانی خەوالّووش هەر لەخەودابێ

★ ★ ★

بالّندەم دیون بەئاسمانەوە
دەنیشتن لەسەر درەختی بەرز
لەترسی گورگ نەیاندەوێرا
بۆ دانەوێلّە بێنە سەر ئەرز

★ ★ ★

من چۆن بتوانم گورگ بپێکم
لەکاتێکا من لەسەرە مەرگام
خۆری تەمەنم لە ئاوابوونەو
دەستی ئەجەل وا دەدا لەدەرگام

★ ★ ★

کۆرپەکـــەم هێشـــتا پێـــی نـــەگرتووە
هـــەزاران درِك دەخەنـــە بـــەر پێـــی
هـــەتا نـــەتوانێ چـــاك تـــەکان بـــدا
گـــەر گـــورگ هـــات و نزیـــك بـــۆوە لێـــی

★ ★ ★

ئەســـتێرەی ئاسمـــان نـــوقمی نـــاو هـــەورن
تریفـــەی مـــانگیش کـــزو بـــێ تینـــە
بۆیـــە تارماییـــەك لـــەدور دیـــاربێ
نـــازانم بـــەردە یـــان گورگـــە شـــینە

★ ★ ★

تۆزوغوبـــاری بـــەرپێی ئەســـپەکان
وەکـــو گـــەردەلوول لـــەدور دیـــارە
یـــان ماراســـۆنە بـــەدوای گـــورگ دا
یـــان کـــەژاوەی شـــەڕ بـــەرەو ڕووی شـــارە

★ ★ ★

کۆشـــك و تـــەلاری زێـــڕم بـــۆ بکـــەن
دڵـــم هـــەر لـــەلای کـــانی و ڕوبـــارە
ئـــاخ بـــۆ ئـــەو ڕۆژەی گـــورگ نـــەمێنێ و
تێـــر بنـــووم لـــەبن ئـــەو دارچـــنارە

★ ★ ★

ئـــای چـــەندحەزدەکەم لـــەم ســـەردەمەدا
ڕۆژگـــارم کـــورت بـــێ و درێـــژبێ شـــەوم
بچـــمە ئەشـــکەوتێك گـــورگی لـــێ نـــەبێ و
تـــاڕۆژی مـــــردن بۆخـــــۆم بخـــــەوم

★ ★ ★

مـــــن لەباوەشـــــی ئەشـــــکەوت نـــــەبێ
لـــەهیچ شـــوێنێ تـــر ئـــۆقرە نـــاگرم
گۆچـــان و شمشـــاڵ دەگرمـــــە دەســـــت و
گـــەر گـــورگ نـــەبێ ســـەگ بـــۆ ڕاگـــرم ؟

★ ★ ★

سەگێکم هەبوو سەگێکی سپی
بۆ ڕاوی گورگ پڵینگ ئاسابوو
لەبەر هەڵمەت و نرکەو حەپەحەپ
دەعبای دارستان هەمووی تاسابوو

★ ★ ★

لەنێو ئەشکەوت دێمە دەرەوە
تەماشا دەکەم بەفرو بارانە
دەبێ گورگ بێ دەنگی بێتە گوێم
یاخۆد گڤڤەی باو هاژەی دارانە

★ ★ ★

تۆ داوای میوەی سەوزم لێ مەکە
من درەختێکم گەڵام وەریوە
بەرلەوەی میوەی سەرم پێبگا
گورگ بەکاڵی شیلەی مژیوە

★ ★ ★

ئەودارستانە بباش بپشکنن
نەوەك گورگێك خۆی لێ حەشاردابێ
تامی ئازادی هەرگیز ناچێژن
هەتا مەترسی گورگتان مابێ

★ ★ ★

کەوتوومە گۆمی بیرو ئەندێشەو
خەیاڵی گورگ سەرم بەرنادا
ئەوهەموو بیرو دەردو حەسرەتە
تەمەنی جوانیان بردم بەبادا

★ ★ ★

ڕەوە گورگێك وا لەنێو ئەشکەوتە
منیش تەزیوم لەبەر سەرمادا
دەمەوێ بڕۆم بۆلایەکی تر
بەفری ڕێبەندان ڕێگەم بەرنادا

★ ★ ★

گەر ئێمە وەکو مەڕ نەبوینایە
ئێوەش نەدەبوون بەو گورگە دڕە
گۆشت و ئێسقانمان بێ ترس دەخۆن
بۆیە ورگتان هەمیشە پڕە

★ ★ ★

وەکو ئەو گوڵەی لەچڵ بۆتەوە
ئومێد لەدڵما کەوتە خوارەوە
گورگ دەمی لە زامم دەژەنێ و
منیش ڕێ دەکەم بەئازارەوە

★ ★ ★

ژیانی دنیا هەر یەك نەفەسە
ئیتر ئەو کۆشك و تەلارە بۆچی
گورگیش نەتخوا ئەجەل دەتگاتێ
کرمی ناو بەردیش دێت نۆرەی کۆچی

★ ★ ★

وەکـــــو مـــــۆمێکی کـــــز بســـــوتێ وام
بـــــە هەناســـــەیەك دەکوژێمــــــەوە
مـــن لەدەســـت گـــورگ ڕاکـــە ڕاکمـــەو
ئـــەویش خـــۆی نزیـــك دەکـــا لێمـــەوە

★ ★ ★

تـــەواو بێـــزارم لەدەســـتی گـــورگ
چـــۆن گـــوڵ بێـــزارە لەدەســـت ڕەشـــەبا
درەخـــت و زریـــان گـــورگ و ڕانەمـــەڕ
لەگـــەڵ یـــەکتری قـــەت نـــابن تـــەبا

★ ★ ★

دەســـت لـــەنێو دەســـتی درەخـــت دەنـــێم
زریـــان نـــاتوانێ پـــێم پـــێ لـــەق بکـــا
ترســـی زریـــان و گـــورگم زۆر دیـــوە
زۆریـــش ئەشـــکی خـــوێن لەدیـــدەم تکـــا

★ ★ ★

لەو بیابانەدا ڕێم لێ گۆڕاوە
بەری بەیانیم تاریك و لێڵە
بەهەر لایەكدا هەنگاو هەڵبێنم
گورگی دڕندە بەدوامدا وێڵە

★ ★ ★

گیانی شەڕانگێز لەجەستەی مرۆڤ
وەكو گورگی هارخۆی نیشان دەدا
لەگورگی دوو پێ زیاتر بترسن
ئێسقانیش دەخوا لەم كێڵگانەدا

★ ★ ★

بەری ڕوناكی لێ گرتووم گورگ
خۆی داوەتە بەر دەرگاو پەنجەرەم
لەنێو گێژاوی فرمێسك و خوێنا
بەگەنجی سپی بووە ئەم سەرەم

★ ★ ★

هەڵبەستەکانم وەك شمشاڵی شوان
باسی سەربوردەی پڕ ئازار دەکەن
ئەوەندە ژانیان لەخۆ گرتووە
بیاندوێنی هەر هاوار دەکەن

★ ★ ★

برینی جەستەم بۆسارێژ مەکەن
برینی گەورەم لەهەناو دایە
تا بەبەر دەمما گورگ بێ و بچێ
چۆڕاوگەی زامم کۆتایی نایە

★ ★ ★

کانیلەیەکی سەر ڕێگا بووم و
ڕێبواران پۆل پۆل دەهاتنە سەرم
لەوەتی گورگ دەمی تێ خستووم
لیکاوی گورگ دەڕوا لەبەرم

★ ★ ★

ئەوهـــەموو خەڵکـــە گـــیرودەی گورگـــەو
لەبـــەردەم گـــورگ بەچـــۆك داهـــاتوون
هـــەموویان خـــاوەن ئەســـپ و شمشـــێرن
بـــەڵام بـــێ ورەن ئـــاوا ڕاهـــاتوون

★ ★ ★

چـــەندین ســـاڵە مـــن تـــەکان دەدەم و
بەوهیوایـــەم خـــۆر بگرمـــە بـــاوەش
بـــەڵام کـــە گـــورگ دەبێتـــە چاوســـاغ
دەمخاتـــە ئـــامێز تارماییـــەکی ڕەش

★ ★ ★

وەك ئـــەو قەرەجـــەی کـــە بـــێ لانـــەبێ
چـــك چـــك دەلـــەرزم لەبـــەر ســـەرمادا
خەڵکینـــە وریـــای ماڵـــەکانتان بـــن
گـــورگ پەیـــدابوون لەنـــەوەی مـــادا

★ ★ ★

شـــورەی ماڵـــەکان بـــاش قـــایم بکـــەن
دەرگـــا لـــەگورگ مەخەنـــە ســـەر پشـــت
ئـــەو گورگـــەی ئـــەمڕۆ کەنەفتـــە بـــووە
خـــوێنی هـــەزاران بـــێ تـــاوانی ڕشـــت

★ ★ ★

کـــاتێ کـــە چـــاوم ئەنێمـــە ســـەر یـــەك
گـــورگی دێـــرینم دێتـــەوە بەرچـــاو
موچـــڕکەو تـــەزوو بـــە لـــەشما دادێ
دەتوێمـــەوە وەك بـــەفری بـــەر هـــەتاو

★ ★ ★

گـــەلای تەمـــەنم وشـــك و ســـیس بـــووە
زۆری نـــەماوە بکەوێتـــە خـــوار
لەدەســـتی گـــورگ و ســـەدەی دێوەزمـــان
گیـــانی پەرۆشـــم بێـــزارە بێـــزار

★ ★ ★

زۆرلەمێـــــژبوو مـــــن  هـــــاوارم دەکـــــرد
ئـــەو هـــەموو گورگـــە لـــەکوێ دێـــن بۆمـــان
بـــەڵام کـــە ســـەیری نـــاوخێڵم دەکـــەم
گـــورگ دەبیـــنم لـــە نـــەوەی خۆمـــان

★ ★ ★

خـــــودا لـــــەزەوی مرۆڤـــــی دانـــــا
ببێتـــــە دادوەر دادیـــــش بـــــەرپاکا
بـــەڵام مـــرۆڤ بـــوو بـــەگورگی برســـی
وەختـــە دارو بـــەرد لەدەســـتی ڕاکـــا

★ ★ ★

ڕەوە پەپوولـــــەی خـــــەیاڵ و هەســـــتم
چـــیمەن و گـــوڵزار دەکـــەن بەلانـــە
دەزانـــــن گـــورگ ناچـــێتە گـــوڵزار
جێـــی ئـــەو هەمیشـــە  باســـك و تەلانـــە

★ ★ ★

بۆهەر مێگەلێك شوانێك بەس نیە

دەبێ هەمووتان ببن بە شوان

لێشاوی گورگان هێندە زۆر بووە

بەری ناگیرێ بە یەك و بە دوان

★ ★ ★

دەستی بەخوێن سور لەنێو خەڵكدا

هەردەم دیارەو قەت بزر نابێ

دەستێك بەخوێن بێ وەك لەپی گورگ

بۆ بڕین باشە گەر هی پاشابێ

★ ★ ★

بەئاهم وەختە زینگە گڕ بگرێ و

نەفەس نەمێنێ لەنێو هەوادا

تادوێنێ لەگەڵ گورگ شەڕم بوو

ئیمڕۆكەش لەگەڵ پیاوی گەوادا

★ ★ ★

هەزاران کانی و کاریزی تەقیو
لەگەڵ هەزاران جۆگەلەو ڕوبار
گورگ ئەوەندە گڵاوی کردن
بەناخ و گەرووی خاکدا چوونەخوار

★ ★ ★

بەئاوازێکی زۆر حەزینەوە
مەلێك دەخوێنێ لەسەر دارەوە
لەترسی گورگ ڕەنگە نەوێرێ
بۆ کەناری ئاو بێتە خوارەوە

★ ★ ★

ئەو درەختانە بۆ دائەپاچن
کە جێ هیلانەی سەدان باڵدارە
بەدەستێکەوە وەك ڕنەی گورگ
هەڵدەوەرێنن گەڵای ئەودارە

★ ★ ★

ڕەنگە بپرسن لەوەرزی بەهار
گەلای ئەوداره بۆ هەڵوەریوە
چۆن لەبەر گورگ من شڵەژاوەم
ئەویش لەترسی زریان تۆقیوە

★ ★ ★

چونکە گوڵ ڕۆیی بەسەرچوو بەهار
گوڵزاریش جوانی جارانی نەما
ئەو لالەزارەی جێی باڵندان بوو
ئێستاکە گورگ لێی دەکا سەما

★ ★ ★

چونکە گوڵ ڕۆیی . قات و قڕی هات
بۆنی گوڵزاریش نەما لەم ناوە
ئەو دارستانەی شێر خودانی بوو
ئێستا گورگ خۆی لێ مەڵاس داوە

★ ★ ★

ئەوهەموو گوڵ و نێرگزە جوانە
شەونم لەچاویان وشك بۆتەوە
گورگ ئەوەندە تێکی شێلاون
ڕەش داگەڕاون ڕەنگیان چۆتەوە

★ ★ ★

بەری ئاسمانی گرتووە هەور
بۆیە تارمایی دنیای داپۆشی
تارمایی گورگ و تارمایی مرۆڤ
هەردوو تالآوم پێکەوە نۆشی

★ ★ ★

هەورێکی نەزۆك بەئاسمانەوە
نەکۆچ دەکات و نەدەشبارێنێ
گەر هەور بەری ڕوناکی بگرێ
گورگ بێ ترس پەلامار دێنێ

★ ★ ★

تەنها سیس بوونی گوڵەکان نەبوو
ئەم وەرزەی تووشی گەڵاڕێزان کرد
کە گورگ هات و گەرای خۆی دانا
جوانی بەهارو بزەی سروشت مرد

* * *

تا دڵ بەتەمای ئەو گوڵزارەبێ
خونچەیەك تێیدا شکۆفە نابێ
لەسایەی گورگا ئاواتەخوازم
خۆری تەمەنم خێرا ئاوا بێ

* * *

خۆم داوەتە بەر ڕهێڵەی باران
هەتا لەسەرمای بەفرانبار ڕابێم
گەر بەشوێن گورگا بەفر بشێلم
لەگۆ نەکەون پەنجەی دەست و پێم

* * *

ئەوەنـــــدە دەم لـــــە زامـــــم مـــــەژەنن
بـــــا ســــارێژ بـــــبن برینــــەکانم
چـــەندین ســـاڵە مـــن لەگـــەڵ گورگـــدا
ســـــەرگەرمی شـــــەڕی مـــــان و نـــــەمانم

★ ★ ★

ســـەیری غوربـــەتی ئـــەم گونـــدە دەکـــەم
دەرگـــــای ماڵـــــەکان گشـــت داخـــــراون
دەبـــــێ لـــــەگورگ خـــــۆ بپـــــارێزن
یـــــان لەبـــــەر زریـــــان وا پەشـــۆکاون

★ ★ ★

وەك گورگێـــك دەمـــی لـــە کـــەلاك نـــابێ
وا بـــۆنی خـــوێن دێ لـــە هەناســـەتا
لاشـــەم وەکـــو مـــۆم کزکـــز دەســـوتێ و
خـــۆی نـــاگرێ لەبـــەر گـــڕی مەینـــەتا

★ ★ ★

من بێگومانم کە سەری ڕەشت
لەبەر ئەندێشەی گورگ سپی بوو
ئەو حەزەجوانەی کە لەدڵتابوو
لەتاڤ لاوی تووشی کپی بوو

★ ★ ★

ئۆقرەو ئارامی ( ئەیوب ) م نیە
بەرانبەر گورگ خۆگریم تاکەی
کەوێڵم بۆتە کوورەی خەفەکراو
خودایە ئاوێك بەو ئاگرە داکەی

★ ★ ★

ئای لەورۆژانەی کە بێ شمشێربووم
لەنێو ئەشکەوتان خۆم حەشار دەدا
سەگێکیش نەبوو پاسەوانم بێ
هەربە بەرد گورگم پەلامار دەدا

★ ★ ★

ئـــــۆقرەو ئـــــارامم لـــــێ هــــــەڵگیراوەو
ڕەشــــەباو زریـــــان یەخـــــەم بــــەرنادەن
وەکـــو گـــورگی هـــار مەبەســـتیان وایـــە
ڕەنجـــی چـــەند ســـاڵەم هـــەمووی بـــەبادەن

★ ★ ★

لەدنیایـــــــــەکی پـــــــــڕ لەگورگـــــــــدا
هـــــەموو ڕێگاکـــــان بـــــەترس و لـــــەرزن
لـــــەنێو ئەوهـــــەموو ڕێچـــــکە زۆرانـــــە
تـــەنها ڕێـــی ســـەخت بـــۆ لوتکـــەی بـــەرزن

★ ★ ★

بـــــەرەو ئەشـــــکەوتێك هـــــەنگاوم دەنـــــا
گـــــــــورگ بەشـــــــــوێنم نائاشـــــــــنابوو
ســـەگی مـــاڵی مـــیر شـــوێن پێـــی هـــەلگرتم
ئـــاخ بۆئـــەو ســـەگەی کـــە بـــێ وەفـــابوو

★ ★ ★

بـــۆ ئەومناڵـــەی گـــورگ خـــواردی
ئەشـــکی زۆرم ڕشـــت لەچـــاوەکانم
مـــەرگی ئەوانـــەم بـــەبیر دێتـــەوە
لەگیانـــدان ســـەریان نـــابوە ســـەر ڕانم

★ ★ ★

ســـەرم ســـەبەتەی پـــڕ لەخەیاڵـــەو
لـــەنێو گێـــژاوی خەیاڵـــدا دەژیـــم
خـــەیاڵی گـــورگ خـــەیاڵی مـــەرگ
نـــەفرەت لـــەورۆژە ڕەشـــانەی کـــە دیـــم

★ ★ ★

ئـــەو کەڵبـــە پیســـەی کـــە گـــورگ لێیـــدام
زامەکـــەی قـــووڵ بـــوو گەیشـــتە گیـــانم
وەك ئەســـپی زامـــدار تـــەکان دەدەم و
وەختـــە بگەمـــە کۆتـــایی ژیـــانم

★ ★ ★

لەسەرابێکام هەتا چاو بڕکا
بەس گورگ دیارە بەبەر چاوەوە
خەو بەدیمەنی جوان جوان دەبینم
دیمەنی کانی و تاڤگەی ئاوەوە

★ ★ ★

درەخت وایە گەر بەریش نەگرێ
خۆ سێبەرەکەی فێنك و دلگیرە
بەلاّم مرۆڤی بێ بەهرەو عەقڵ
بێ سودە وەکو گورگێکی پیرە

★ ★ ★

کاتێ دەچمەوە زێدی باپیرەم
شتە جوانەکان دێنەوە یادم
مەتارەو گۆچان گورگ و حەپەی سەگ
بەیادی هەموو یادەکان شادم

★ ★ ★

لەبن سێبەری ئەم دارچنارە
سەرم بەتاشە بەردێك كردووە
گورگ دیار نیەو دنیا هێمنە
ڕۆژی وا خۆشم ڕانەبواردووە

★ ★ ★

گەرترسی گورگی دڕندەم نەبێ
حەزدەكەم بەنێو دارستان ڕابم
گەر بست بەبستی شی بكەمەوە
لەجوانیەكانی هێشتا تێر نابم

★ ★ ★

هەتا نیگای تۆ لێڵ و تاریك بێ
گورگیش لەدەرگات دێنە ژوورەوە
تۆ دەرگای دڵت والآكردووە
چۆن پێشیان دەگری لەسنورەوە

★ ★ ★

خوزگە نهێنی ئەوەم دەزانی
کە گورگ بۆچی هێندە زۆرخۆرە
بۆ بەنێچیرێك تێنووەتی ناشکێ
زگی ئەم و ئەو دەدڕێ بەمجۆرە

* * *

زۆرجاران گورگ ڕێم لێ ون دەکا
زۆرجاریش بۆخۆم ڕێم لێ ون دەبێ
لەترسی تۆیە ڕێ گۆڕی دەکەم
وەختە لەداخت جەرگم کون دەبێ

* * *

ئاخۆ کەی ڕۆژێك جەستەی تەزیوم
لەبەر ئاگردان گەرم بێتەوە
تارمایی گورگ و ترس و دوودڵی
لە ژوورەکەمدا بڕەوێتەوە

* * *

من لەئاکامی خۆ لەبیرکردن
لەم دێمەکارە تەنیا جێماوم
وەکو کەو بەسەر بەرداندا دەڕۆم
تا گورگ نەیەن بەشوێن هەنگاوم

★ ★ ★

ڕۆژ نیە کەوا هەواڵێکی ڕەش
لەدەرگام نەدا وەکو ڕەشەبا
هەواڵی گورگ و کەڵبەو تۆقاندن
ئەو ژینە تاڵە خۆزگە هەر نەبا

★ ★ ★

هەتا سەگەکەم وا خەواڵوو بێ
گورگ بەردەرگای ماڵم بەرنادا
زستانەو زریان گڤڤەگڤی دێ
گیانم تەزیوە لەنێو سەرمادا

★ ★ ★

دەستم لەگەڵای درەخت داوە

لەنەرمی وەکو ئاوریشم وایە

گەرترسی گورگ لەئارا نەبێ

بەرئەم سێبەرە بەهەشتی خوایە

★ ★ ★

ژیانم بەرەو کۆتایی دەچێ و

کاروانی تەمەن تێپەڕی بەژان

لەنێو گورگاندا سەرم سپی کرد

سەرم پڕ تەمە وەك لوتکەی کەژان

★ ★ ★

زۆر دڵنیانیم ئەو خشپەخشپە

خشپەی پێی گورگە یان گڤڤەی بایە

دەبێ هەمیشە شمشێر بەدەست بم

لەوەتی من هەم ژیانم وایە

★ ★ ★

چــــاوەڕێی ئـــەوەم کـــە ڕۆژێـــك دابـــێ
ئـــەو گورگـــە ڕەشـــەم لەبەرچـــاو ون بـــێ
تـــیرو کـــەوان و شمشـــێر بۆچـــی یـــە
ئـــەم شـــارە گـــەورە کـــە هـــەمووی ژن بـــێ

★ ★ ★

ئـــەو گورگـــە پـــیرە بـــە تـــەنها نیـــە
ڕەوە گـــورگێکی گـــەورەی لـــە پشـــتە
کـــــــوورەی دەروونم لرفـــــــەلرفی دێ
بـــۆ ئەومناڵـــەی بـــێ سەرپەرشـــتە

★ ★ ★

وەك ئـــەو ماســـی یـــەی بـــۆ لـــەتێ هـــەویر
دەمـــــی لـــــەنووکی قولابـــــدا گیربـــــێ
ڕەنگـــە ئـــەو کۆرپـــەش بۆلەتـــە نانێـــك
بەدەســـتی گورگێـــك مـــات و ئەســـیربێ

★ ★ ★

ئـــای چـــەن حەزدەكـــەم لەبـــەهارێكا
جەســـتەم بدەمـــە بـــەر لێزمـــەی بـــاران
هـــــەتا لـــــەگورگ پـــــاك ببێتـــــەوە
وەكـــو ســـــەوزەگیا وەك گـــــەڵای داران

★ ★ ★

مـــــەلێكی برســـــی لەســـــەر ئـــەم دارە
زۆر بەحـــــــــەزینی وا هـــــــــەڵكوڕماوە
لەچـــاوی گـــــورگ خـــــۆی شـــــاردۆتەوە
نـــــازانێ گـــــــورگ دێ لـــــــەكام لاوە

★ ★ ★

بـــــەهار پـــــایزی هـــــاتوە بەگـــــژا
یـــان وشكەســـاڵەو گـــەڵا زەرد بـــووە
وەك ئـــەو مێگەلـــەی گـــورگی لـــەناو بـــێ
دارســـــتان تووشـــــی هـــــەزار دەرد بـــووە

★ ★ ★

بەرلـــــە هـــــاتنی گـــورگ بـــۆ ئێـــــرە
دارســـتان هـــەمووی میـــوەو هـــەنگوین بـــوو
هەناســــــەت دەداو هەناســــــەت دەمـــــژی
بـــۆن و بەرامـــــەی گـــوڵی ڕەنگـــین بـــوو

★ ★ ★

بـــاران گیـــانی خـــۆی دەبەخشـــێ بـــەخاك
تـــــا گیـــــان بێتـــــەوە بەبـــــەر گیـــــادا
شـــــــوانێکیش نیـــــە گیـــــانی ببەخشـــــێ
تـــــــا شــــــەڕی گـــــــورگ لەئێمــــــــە لادا

★ ★ ★

نـــــازانم لـــــــەنێو ئـــــــەم دارســـــــــتانە
ســـــایەی کـــــێ بکـــــەم بەچـــــەتری ســـــەرم
کەسێك شـك نابـەم شمشـێر بەدەسـت بـێ و
لەترســـــی گـــــورگ هانـــــای بـــــۆ بـــــەرم

★ ★ ★

هـــەر ئـــەو دەســـتانەی نـــەمامیان دەچـــاند
ئێســــــتا درەخـــــتی پـــــێ دەبڕنـــــــەوە
وەك ڕەوە گورگێـــــك كەوتبێتـــــە ناومـــــەڕ
لەســــــەر نەخشـــــەدا دەیـــــان ســــڕنەوە

★ ★ ★

كـــــە دارو درەخـــــت ڕیشـــــەی داكوتـــــا
مــــروڤ هەڵســـــتا تـــــەوری دروســــت كـــــرد
بـــــەڵام كـــــە گـــــورگ هاتـــــە دارســـــتان
هەرئـــــەو مرۆڤـــــە كڕنۆشـــــی بـــــۆ بـــــرد

★ ★ ★

كـــە حەپـــەی ســـەگ و لـــوورەی گـــورگ دێ
لەخـــــەوی غەفڵـــــەت زوو بـــــەئاگا دێـــــم
لــــــەنێو ژیلــــــەمۆ و بڵێســـــەو گـــــڕدا
لەژینگـــــەی ناســـــاز خەریكـــــە ڕابـــــێم

★ ★ ★

لوورەی ئەوگورگە هێندە نزیك بوو
سەری لەدەرگا پێ هێنامەدەر
چ رۆژگارێکی پڕ لەئاشوبە
ناتوانین بژین بێ نێزەوخەنجەر

★ ★ ★

وا جارێکی تر هەورو تەم و مژ
دەیانەوێ خۆر بزرکەن لێمان
هەتا تاریکی ڕێگاکان بگرێ و
گورگی درندە بێنە سەر ڕێمان

★ ★ ★

بەرەو بەرزایی هەنگاو هەڵدێنم
گەر گورگیش هەبێ لەسەرەڕێما
لەوەتەی من هەم لوورەی گورگ دێ و
دەنگی نەبڕاوە هەرگیز لەگوێما

★ ★ ★

گەر بەم دەستانەم گۆڕ هەڵبکەنم و
بۆخۆم درێژبم لەنێو گۆڕەوە
لەبەردەم گورگا بەچۆکدا نایەم
تف لەچەماوەو سەری شۆڕەوە

★ ★ ★

شوانێکی نەفام مەترسی ترە
لەگورگێك کەوا لێت دانووسابێ
دەردی نەفامی بەئازارترە
لەزامێکی قووڵ کە لەلەشتابێ

★ ★ ★

بێ مروەتی شوان وەهای کردووە
کە ژینی ئێمە سۆزی تیا نەبێ
بۆ ڕەجمکردن باشە ئەو ژینە
کە لەگەڵ ژینی گورگ جیا نەبێ

★ ★ ★

وا دڵڕەق مەبە ئەی شوانەکەمان
دڵڕەقی تۆیە لەدنیا باوە
ئێمە مرۆڤین تۆش گورگ ئاسا
وا دەمت لەنێو برینمان ناوە

★ ★ ★

من وەکو ڕوبار تەکان دەدەم و
کەناری خۆمم لێ بزر دەبێ
کەنارێك بەپێی گورگ تەنرابێ
وەکو یۆتۆپیا باشترە نەبێ

★ ★ ★

ڕاوچی ئەوەندە ئازا نەماوە
شمشێر لەشان و گیان لەسەر دەست بێ
دەست لەباڵندان بپارێزێت و
سۆراغی سەری گورگی مەبەست بێ

★ ★ ★

سەداو حیلـﮋنی ئـەو جوانـە ئەسـپە
لـە قاسـپەی کـەوان گـەلێك خۆشـترە
گـورگیش نـاتوانێ تخـوبی کـەوێ
چـونکە لـە پڵیـنگ زۆر بەجۆشـترە

★ ★ ★

ئـەو ڕەوە گورگـە لـەدەم کـەنار بـێ
ڕوبـارو کـانی هـەمووی پـیس دەبـێ
لـەناو هـەر مێرگێـك خـۆ بگـەوزێنن
گـوڵ و گـوڵزاری هـەمووی سـیس دەبـێ

★ ★ ★

خـۆری ئاسمـانم لـێ دیـار نیـە
ونبـووە لـەنێو تـەمتومانی چـڕ
لەترسـی گـورگ و زریـان و بـەفر
بەلـەشمادادێ تـەزووی ساردوسـڕ

★ ★ ★

کـــــاتێ شـــــنەی بـــا لــــــەدەرگام دەدا
دڵ وەکـــــــو نێرگــــــز دەگەشـــــێتەوە
بـــــەڵام کـــە دەنگـــی گـــورگ دەبیســـتم
خونچــــــەی ئــــــارەزووم دەپوکێتــــــەوە

★ ★ ★

ئەوەنــــــدە بـــــەفر لـــــەڕووم پـــــژاوەو
بـــــەدوای گورگـــــدا بـــــەفرم شـــێڵاوە
ئێســـــتاش بـــــەری پـــێم شەقارشـــــەقارن
وردە برینیـــــــان هەرتێـــــــدا مـــــــاوە

★ ★ ★

دەروازەی شـــــاریان لـــــەڕوو داخســـــتم
چـــــونکە دەزانــــــن پـــــەیامم پێیـــــە
بـــــەدڵ حەزدەکــــەن گـــورگ بمخـــوا
تـــا بۆیـــان نەبمـــە چـــرای ئـــەو ڕێیـــە

★ ★ ★

گلێنەی چاوم وەك دوو دڵۆپە
بەسەر گۆناما هاتنەخوارەوە
لەگەڵ گورگدا ژینم بەرێکرد
بەدڵێکی پڕ لەئازارەوە

★ ★ ★

لەسەرو بەندی خۆر ئاوابووندا
کۆمەڵە گورگێك لەنزیك لادێ
خۆیان لەمێگەل دانوساندووە
چاوەڕێ دەکەن هەتا شەودادێ

★ ★ ★

من ترسێکی زۆر هەست پێدەکەم و
دەزانم گورگ کەوتۆتە ناومان
هێندەی چاوەڕێی شوانێکی تربین
وەختە هەڵوەرێ گلێنەی چاومان

★ ★ ★

وەك ئــەو ڕێبـوارەی کــە بــێ پــێلاو بــێ
تــــۆ بەترســـــەوە هــــەنگاو هەڵـــــدێنی
دیــــارە مەترســــی گورگــــت زۆر دیــــوە
بۆیــــە بــــەگومان ڕێچـــکە دەشـــــکێنی

★ ★ ★

مـــن پــێ بخەمـــە ســـەرهەر ڕێگایـــەك
پـــاش چـــەند قۆناغێـــك دەبێتـــە دووڕیـــان
لـــە هـــەردوو ڕێگـــاش دەنگـــی گـــورگ دێ
گوێچـکە کـەڕ دەکـەن بـە لـــوورە لووریـــان

★ ★ ★

زووبــێ یـــا درەنـــگ ئـــەمڕۆ یـــا ســبەی
دەبــێ تەنگـــە بـــە گـــورگ هەڵبەســــتم
لــــەم دێ بـــۆ ئـــــەودێ ڕاوی بنــــێم و
ئاســــودە بـــبێ خـــــەیاڵ و هەســــــتم

★ ★ ★

لەگـــــەڵ گورگـــــدا ســـــەربردەم زۆرە
یادگاریـــــەکانم قـــەت لـــەبیر ناچـــن
کەڵبـــەو چـــڕنووکم کـــە دێنـــەوە بـــیر
وەختـــــە وەك درِك لـــــەدڵم ڕاچـــــن

★ ★ ★

لێـــرە خەریکـــە خـــوێن ســـەران ببـــا
ئەمانـــەش هێشـــتا هـــەر تێنـــووی خـــوێنن
لـــەجیاتی شـــەڕاب خوێنـــاو دەنۆشـــن
بـــەزمانی گـــورگیش خـــەڵك دەدوێـــنن

★ ★ ★

لـــەداخی گـــورگ ســـەری خـــۆم هـــەلگرت
بەدەســـت خـــۆم نـــەبوو کەوتمـــە غوربـــەتی
لەچـــڵی هیـــوا بـــەربووە دەســـــتم
وا گینگـــــڵ دەدەم لـــــەنێو مەینـــــەتی

★ ★ ★

لەپێدەشتەکان تا لوتکەی کەژان
فرسەخ بەفرسەخ هەمووی گەڕاوم
جگە لەڕێچکەی گورگ و ڕێوی دا
شتێکی ترم نەدی بەچاوم

★ ★ ★

سەرم سوڕماوە لەو کەسانەی کە
بەلوورەی گورگ دەکەونە سەما
هێمای جوانیان وا دزێو دەبێ
دەڵێی هەرماسن لەبەر دیدەما

★ ★ ★

وەك گوڵەگەنمێك کە با ڕایژەنێ
بەلادادەچم وەها بێ هێزم
گۆپاڵێك نیە بیگرمە دەست و
خۆمی لەگورگ پێ بپارێزم

★ ★ ★

لەجێی ئەوهەموو نەغمەو ئاوازە
گوێچکەم بەلورەی گورگ کرایەوە
چاوم هەڵێنا یەکەمین دیمەن
گورگ لەچاوما ڕەنگی دایەوە

★ ★ ★

یەك یەك چراکان دائەگیرسێنم
لەسەرەڕێی ئەو کاروانسەرایە
گورگ ئەو سەرەڕێیانە ناگرێ
کە سەریان لەنێو ڕوناکی دایە

★ ★ ★

دەبێ قاپوتی ئاسن بکەینەبەر
ئینجا بەنێو ئەو جەنگەڵە ڕابین
گەر هات و گورگیش پەلاماری داین
بەکەڵبەکانی کاریگەر نابین

★ ★ ★

نـــــــازانم بۆچـــــــی دڵەخورپەمـــــــەو
دڵــــم لەگـــــەڵما هـــــەردەم لەجەنگـــــە
بـــــەلاّم وەك جـــەنگی مــــن و گـــورگ نـــا
جەنگێکـــــە تـــابڵێی کـــڕو بـــێ دەنگـــــە

★ ★ ★

ئـــــەو درەختـــــە چـــــەند گـــــەلاّی پێوەیـــــە
ئەوەنـــــــدە خـــــــەون لـــــــەنێو دڵمایـــــــە
خــــــەونی واهەیـــــە وەك لـــــوورەی گورگـــــە
خــــــەونی واش هەیـــــە وەك شـــــنەی بایـــــە

★ ★ ★

شـــــەو لـــــە خـــــەونم دا گـــــورگم ڕاو دەکـــــرد
دنیـــــا ببـــــوو بـــــە بەهەشـــــتی بـــــەرین
لـــــــــە دەم کـــــــەناران ڕادەکشـــــــــام و
ســـــەوزەگیای نـــــەرمم دەکـــــرد بەســـــەرین

★ ★ ★

لەبەر زریان و لرفەلرفی با
ئەو درەختانە چەن بەئازارن
ئێمەش بێزارین لەدەست ئەوانەی
کە مرۆڤن و وەك گورگی هارن

★ ★ ★

وێڵ و ئاوارەی نێو جەنگەڵێکم
کە پڕی گورگ و ڕێوی فێڵبازە
ئەستێرەی بەختم هێندە کزبووە
وەك منداڵێکی زەبوون بێ نازە

★ ★ ★

من لەدەست گورگ ڕزگارم نابێ
مەگەر مردن بۆم ببێتە چارە
یان سەرهەلگرم بۆ ئەو کیشوەرەی
کە سەدان فرسەخ دورە لەم شارە

★ ★ ★

لەبـــەر زریـــان و بـــەفری ڕێبەنـــدان
تـــەواو ســـپی بـــوو قـــاپوتی بـــەرم
لەترســـی گـــورگ وام بـــەدیار مێگـــەل
گـــەلای دار دەکـــەم بەچـــەتری ســـەرم

★ ★ ★

چـــەندین ســـاڵە مـــن ڕێبـــواری ڕێـــم و
دەگەڕێمـــــــەوە بەهـــــــەمان ڕێ دا
بـــەپێڵاوی تـــەنگ هـــەنگاو داوێـــم و
گـــورگیش لەدوامـــە لێـــرەو لـــەوێ دا

★ ★ ★

ڕۆژنیـــە گورگێـــك لـــەدایك نـــەبێ و
دەیـــان مـــرۆڤیش نەچـــنەوە ژێـــر خـــاك
دەڵـــێن ئەوكاتـــە دنیـــا تێـــك دەچـــێ
کـــە لەســـەر پشـــتی نـــەما پیـــاوی چـــاك

★ ★ ★

بەهـــــەر لایەکــــــدا چـــــاوان بگێـــــڕم
دەبیـــــنم گـــــورگ لــــــە زێــــدم دایــــە
لەســــــایەی گـــــورگ و گورگبــــــازی دا
ماتــــــەمی خـــــێڵم کۆتـــــایی نایــــــە

★ ★ ★

هـــــەروەکو ســـــیزیف هیــــوام کزبـــــووەو
بەکەڵبـــــەی گـــــورگ لاشــــەم کــــون کونــــە
هــــــەتا چـــــاوبڕکا دەڕوانمــــــە ئاســـــۆ
تروســــــکەی هیـــــوا لەچـــــاوم ونــــــە

★ ★ ★

ئـــــەو ڕێبوارانــــــەش وەك ئـــــەوانی تـــــر
ڕێیــــــان ون بـــــووە لەتـــــەم ومـــــژا
لەپەناوپێچـــــــی ئـــــــەو ڕێگایـــــــەدا
ڕەنگـــــە گورگێکیـــــان هـــــاتبێ بەگـــــژا

★ ★ ★

تا خوێن لە زامی ئێمە بچۆڕێ
گورگێکیش دەبێ فڕی کا وەك ئاو
خوێن لەلای ئێمە هێندە بێ نرخە
پێی لێدەخشێنین بەچەکمەو پێلاو

★ ★ ★

شەوێکی ساردو پڕ تەمتومانە
لەپەنجەرەوە دەنگێ دێتە ژوور
دەنگی گورگێکە بۆ قووت دەگەڕێ
بەڵام نازانم نزیکە یان دور

★ ★ ★

شوانی ئەم گوندە هێندە فێڵبازە
مرۆڤی زاناش بە مەڕ دەفرۆشێ
لەگەڵ ئێمەدا شین و زار دەکا
لەگەڵ گورگیشدا گۆشتاو دەنۆشێ

★ ★ ★

تـــۆ زۆرجـــار باســـی گـــورگ و مـــەڕ دەکـــەی
بـــەڵام خـــۆت گـــورگی و لەکـــەوڵی مـــەڕدای
گـــەر بـــۆت هەڵکـــەوێ کەڵبـــەم لـــێ دەدەی
تـــۆ هـــەر ئـــەوەبووی کـــە ئێســـتاکەش وای

★ ★ ★

لـــەنێو ئەشـــکەوتێك خـــۆم حەشـــار داوە
(بـــا) ی ئەوســـەرانەش زۆر ساردوســـڕە
کرێـــوەو زریـــان لـــەڕووم ئـــەپرژێن
چـــڕنووکیان وەك ئـــەو گورگانـــە دڕە

★ ★ ★

پەنجـــەم گەیانـــدە زامـــە قووڵەکـــەم
بـــۆنی لیکـــاوی گـــورگی لـــێ دەهـــات
من هەرچـــەند لەبـــەر گـــورگ ڕامـــدەکرد
ئـــەو بـــەرەو ڕووی مـــن پـــێ بـــەپێ دەهـــات

★ ★ ★

تەنها سێبەرێك بۆمن بەس نیە
دەبا چەتری تۆش ببێتە سایەم
لەسایەی گورگا سێبەرم نەدی
ئێستاش گیرۆدەی ئەم ڕەشەبایەم

★ ★ ★

ڕەوە گورگێك وا لەدور دیارە
ئاخۆ سەربکەن بە چ دەوارێك
بەپێی گلاو و هەنگاوی نەگریس
پیسی بخەنە چ گوندو شارێك

★ ★ ★

شەو لەخەونمدا گورگێكم بینی
دەمی لەزامی کۆرپەکەم نابوو
بەلام ئێستاکە خۆ خەون نیە
وا لە خۆماندا گورگ پەیدابوو

★ ★ ★

گورگێک لەدەورەی ماڵم دەگەڕێ
لەبەر دەرگامان تەپ و تۆز دەکا
دەمەوێ داوی بۆ بنێمەوە
ڕەشەبا تەونم لێ ئاڵۆز دەکا

★ ★ ★

هەیوانێک نیە بچمە ژێریەوە
من ڕێبوارێکم لەبەر باراندا
گورگ هێلانەی لێ داگیرکردوم
وێڵ و ئاوارەم بەنێو شاراندا

★ ★ ★

لەناو ژوورێکی داخراوەوە
لەترسی گورگ خۆم حەشارداوە
کەمێک ڕوناکی نابینم بەچاو
خۆری من لەنێو هەورا خنکاوە

★ ★ ★

ئـــەو ڕۆژانـــــەم قــــەت لــــەبیر ناچـــنەوە
کـــە لانــــەم پـــڕی دوپشـــکو مـــار بـــوو
ســــــەرم لـــــــەدەرگا دەهێنایــــــــە دەر
تەماشـــــام دەکـــــرد گـــــورگ دیـــــاربوو

★ ★ ★

هـــەزاران نـــەفرەت لـــەو چـــەرخە ســـپڵەی
کـــــە شـــــکۆی داوە بـــــەگورگ و ڕێـــــوی
شـــان وشـــەوکەتی کـــەر بـــەرز دەبـــێ و
ئەســـپی ڕەســـەنیش بـــەد دەبـــێ نێـــوی

★ ★ ★

ڕەوە گـــورگێکی لـــوز بـــەخوێن بـــوون
خـــەونی ئێمـــەیان خســـتە ژێـــر پێـــوە
ئـــای چـــەند خەمناکـــە ئـــەم ڕۆژگارەمـــان
قورســـایی خـــەمی هاوســـەنگی کێـــوە

★ ★ ★

خۆزگــــە ئەســــپێك و دوو ســـەگم دەبـــوو
ســـــۆراخی ســــەری گـــــورگم کردبــــا
تیرانـــــــدازێکی ئـــــەوتۆ بومایـــــــە
بــــەتیری دەســــــتم گـــــورگ مردبـــــا

★ ★ ★

کـــــە بازتـــــان دەدا بەســــــەر جەســــتەما
واتـــــان دەزانـــــی مــــن بـــــەردە بــــازم
ئێـــــوە وەك گـــــورگ کـــــە درنــــــدەبن
بــــــە چ کــــــارێکی ئێـــــــوە بنــــــازم

★ ★ ★

کـــــە هـــــەور بـــــەری ئاسمــــانێ دەگـــــرێ
تـــــەم و مـــــــژێکیش ڕووم دادەپۆشـــــێ
گـــورگ وەك میکـــــرۆب بەربۆتــــە گیــــانم
گــورگ وا تـــك تـــك خـــوێنم دەنۆشــــێ

★ ★ ★

لەبەر ڕۆشنایی مانگی چواردەدا
گورگ دیارەو دەجولێتەوە
تا تریفەی مانگ بەسەرمەوەبێ
هەرگیز ناوێرێ نزیك بێتەوە

★ ★ ★

لەشەڕی مان و نەمانی گورگ
چەندین ئازیزمان سەری نایەوە
ئەوان ڕۆیشتن بوون بەخۆڵەمێش
گورگیش بۆخەمی ئێمە مایەوە

★ ★ ★

ئای لەو ڕۆژانەی کە ڕۆژی ڕەش بوون
زۆریش بە سستی دەچوون بەڕێوە
ماجەرای گورگ زوو پیری کردم
ئێستاش کەنەفتەم کەوتووم لەجێوە

★ ★ ★

درەخـــــتی ژیـــــنم زەرد هەلگـــــەڕاوەو
ناگەڕێتـــــــەوە عــــــومری بـــــابردووم
قـــــولابی گــــورگ لــــەپێم گیربــــووەو
لـــــەبێ هێزیـــــدا وابــــزانن مـــــردووم

★ ★ ★

لـــــەنێو هـــــەزاران هـــــەزار دەعبـــــادا
لـــووڕەی گـــورگ بـــێ دەناســـم دەنگـــی
جانـــــــەوەرێکی هێنـــــــدە دزێــــــوە
هـــــەر لــــە دورەوە دیـــــارە ڕەنگـــــی

★ ★ ★

زۆرلەمێـــــژە مــــــن مـــــەلی ئـــــاواتم
کەوتۆتـــــە تــــۆڕو بەنـــــدی گورگـــــەوە
وامــــــن دەنـــــاڵم بەدەســــــتی دیلـــــی
گـــــورگیش دەنـــــاڵێ بەدەســـــت ورگـــــەوە

★ ★ ★

تــــۆ چــاك بزانـــه مـــن خەنجـــەرێك نـــيم

بشــــێم بـــۆ قـــەدى هـــەموو كەمـــەرێك

لـــەجياتى گـــورگ خـــەڵك زامـــدار كـــەم

يـــان ببمـــە قـــەلغان بـــۆ هـــەموو ســـەرێك

★ ★ ★

بــــــەهيواى ئـــــەوەم پــــــايز دابێـــــت و

گــــــەلاً نــــــەمێنێ بــــــەڕووى دارەوە

ئەگـــــەر گـــــورگ هــــات لــــەدور ديـــــاربێ

پـــێش ئـــــەوەى بگەينــــە بــــەفرانبارەوە

★ ★ ★

لرفــــە لــــرڤ (بــــا) لــــەو شــــاخانە دێ

يــــان لــــوورەى گورگـــــە دێتــــە گوێمــــەوە

دارو بەرديشــــم لــــێ بــــوە بــــە گــــورگ

رۆژێ نــــــەبوو مــــــن بحەســــــێمەوە

★ ★ ★

جریـــوەی مـــەل و قاسپەقاســـپی کـــەو
ســـەداو ئاوازیـــان قـــاتی بـــووە لـــێم
لەدەشـــت و کێـــو و چـــەم و ڕوبـــاردا
هـــەر لـــوورە لـــووری گـــورگ دێتـــە گـــوێم

★ ★ ★

داد بۆکـــەس نابـــەم ئەگـــەر بشـــمرم
هـــەرخۆم ڕوو بـــە ڕووی گـــورگ دەبمـــەوە
هـــیچ ئومێـــدێکم بـــەو شـــوانە نیـــە
وەك بەسالاچـــوو پیشـــەی هـــەر خـــەوە

★ ★ ★

پەنجـــەرەی مالّمـــان دەخەمـــە سەرپشـــت
بـــا کـــزە بایـــەك بێتـــە ژوورەوە
ژوورێـــك خـــۆر تێیـــدا ڕەنـــگ نەداتـــەوە
وەك کونـــە گورگـــە وا لـــەدورەوە

★ ★ ★

هـــــەرگیز نەمـــــــدیوە دوو پەڕەســــــێلکە
دوژمـــــنی یـــەك بـــن یـــەكتر نـــەدوێنن
لەدارســـــــتانێك گـــــورگ ســــــەرداربێ
باڵنـــــدەكانیش دەنـــــووك بـــــەخوێنن

★ ★ ★

ئاگرێـــــك لــــەنێو خوێنمــــا دەســــوتێ
گرِوگڵپەكـــــــــەی زۆر بـــــــــەئازارە
برینـــــەكانم ســـــاڕێژ نابنـــــەوە
چـــونكە جـــێ كەڵبـــەی گـــورگێكی هـــارە

★ . ★ ★

لـــــەنادیارەوە هـــــاتم بـــــەرەو دیـــــار
دیـــــاریش بـــــەگورگی ئاشـــــنا كـــــردم
بـــــەرەو نادیـــــاریش دەگەڕێمـــــەوە
ژیـــن تونێلێـــك بـــوو پێیـــدا ڕابـــردم

★ ★ ★

لەبەر زۆربوونی گورگی دڕندە
هەوری ئاسمانیش باران داناکا
کەنارەکانیش بووینە خۆڵەمێش
پیاو دەبێ بەدوای سەڕابدا ڕاکا

★ ★ ★

لەژێر ئاسمانی بێ هەورو باران
خەون دەبینم بەتنۆکێ ئاو
لەسەڕابێکام گورگ هاوڕێمە
بەرپێم تەڕبووە بەڕۆندکی چاو

★ ★ ★

با هەنگاوەکان ببنە یەك تەكان
تا زوو سەرکەوین لەم هەورازەدا
بەرێچکەی گورگ و ڕێوی دا مەڕۆن
دەخزێن لەسەرئەو بەردەبازەدا

★ ★ ★

خەم وەکو کرم بەربۆتە دڵم
وەك چۆن پوورەی هەنگ شانەی تەنیوە
رۆژ بە رۆژ خەمی گورگ زیاد دەبێ
کێ خەمم لەگەڵ دەکا تەنیوە

★ ★ ★

لەوەتەی هەین و خۆمان ناسیوە
گورگ زاڵ بووە بە سەرمانەوە
لەنێوان گورگی ئەم بەرەو ئەو بەر
شەڕە کەڵبەیە لەسەر، مانەوە

★ ★ ★

گورگ خەمێکی قورسە لەدڵما
رۆژ لەدوای رۆژیش قورستر دەبێ
بەخیلی دەبەم بەژینی قەرەج
لەوانەیە ئەو ئەم خەمەی نەبێ

★ ★ ★

شەو نیە کەمن پەرێشان نەبم و
وەك تەونی ئالۆز تێك نەچێ ژیانم
گرێك لەدڵما کەف و کوڵیەتی
وەك گورگێکی هار بەربۆتە گیانم

★ ★ ★

لەگەڵ ئاپۆڕای گورگ و ڕێویدا
ئەوەندەم سەودا سەری کردووە
بۆ خۆپاراستن لەو دڕندانە
پەنام بۆ سەدان قاپی بردووە

★ ★ ★

گورگانە دەژین گورگانە دەخۆن
گورگانە خۆیان لێك دەکێشنەوە
ئەو هەموو گورگە لەسەر سفرە بێ
دەبێ هەندێکیان کاسە بلێسنەوە

★ ★ ★

مـــــن دەزانم کــــە چـــەخماخەی وشـــە
کاریگـــــەرترە لــــە تـــیرو کــــەوان
بـــەلاّم لای گـــورگ جیـــاوازی نیـــە
چ وشـــــەی دزێـــــو چ وشـــەی جـــوان

★ ★ ★

لەگـــــەڵ ئـــــەوەدام دوای ڕێبەنـــــدانیش
بـــەفر ببـــارێ و پـــڕ گوندوشـــاربێ
بۆئـــەوەی لەســـەر پشـــتی ئـــەو بـــەفرە
ئەگـــەر گـــورگ هـــات ڕێچـــکەی دیـــاربێ

★ ★ ★

دارســـــتانێکی چـــەن کـــش و ماتـــە
بـــۆ گـــورگ بۆتـــە ئارامگـــەی شـــەوان
ئـــەو گورگـــەش وەکـــو ڕێـــوی فێڵبـــازە
قـــەت ناکەوێتـــە بـــەر تـــیرو کـــەوان

★ ★ ★

تــــۆ هەرچــــوار دەورت تـــــابوت و مەرگـــــە
بـــەلاّم خـــۆ هـــەرگیز هەســـتی پـــێ ناكـــەی
مـــــادام شـــــوانێكی دەســــــتت لەرزۆكـــــە
لەدەســــــتی گـــــورگ دەبـــــێ هــــەر ڕاكـــەی

★ ★ ★

لـــــــە ئەشـــــــكەوتێكا دورم لــــــــەگورگ
گـــــوێم ڕاگرتـــــووە لـــــە بلـــــوێری شـــــوان
بــــــۆ باســــــك و دۆڵ تــــــــەلان دەڕوانم
چـــــاوم تێرنـــــابێ لەدیمـــــــەنی جـــــوان

★ ★ ★

بـــــای ئـــــەو كەژانـــــە كـــــاتێ هــــــەڵیكرد
خـــــەون و خــــەیاڵی مـــــنی تیـــــا ون بـــــوو
خۆزگـــــەی مـــــن كەوتــــــە دەمـــــی گورگـــــەوەو
وەك یــــاقوت نـــوقمی دەریـــــای بـــێ بــــن بــــوو

★ ★ ★

لەســـــەر كـــــلاّوی كــــەژێك دانیشـــــتووم
(بـــــا) شـــــەپۆڵ دەدا لەتــــەلی هەســــتم
چـــــەن لــــە ڕەشــــەباو زریــــان بێــــزارم
بــەلوورەی گــورگیش ســەد هێنــدە پەســتم

★ ★ ★

لەپڕكەوتمـــــــــــــــە داوی گورگـــــــــــــەوە
چــــەن تــــەكان دەدەم ڕزگـــــاریم نـــــابێ
شمشـــــاڵ و عەســـــاو مـــــەتارەم دانـــــا
بـــۆ ئــــەوەی دەســــتم لەشمشــــێر ڕابــــێ

★ ★ ★

مـــــن نـــــەم زانیــــوە منــــاڵی ســــاوا
ئەوەنــــــدە عەشــــقی تیروكـــــەوان بــــێ
كـــاتێ گـــــەورەش بـــوو لەگــــەڵ گورگـــــدا
هاموشــــۆ بكـــاو متـــوی ئــــەوان بــــێ

★ ★ ★

پێش ئەوەی گورگ بگاتە سەرمان
کەمەرتوند کەن و لەخەو ڕاپەڕن
با زامێکی تر لەجەستەم نەبێ
برینی کۆنم هێشتا هەر تەڕن

★ ★ ★

خونچەی دڵەکەم بەرەو سیس بوونە
خەمیش وەکو هەنگ دەمیان تێناوە
زامێك کە گورگ کەڵبەی لێدابێ
قەتماغە ناگرێ و هەردەم خوێناوە

★ ★ ★

تۆ بۆ یاقوت و مەرجان دەگەڕێی
کە لەژێر دەریاو قووڵایی ئاوە
منیش دەگەڕێم بۆ ئەو بزەیەی
لەدەمی گورگەو لێمان دزراوە

★ ★ ★

بە لوورە لووری گورگەوە دیارە
شار ماتەمینی لەخۆ گرتووە
ئاگرێک لەنێو گیانما دەسووتێ
گڕوبڵێسەی بەخوێن هەڵبووە

★ ★ ★

من بەو هیوایەم کە ڕۆژێک دابێ
خۆر دەربکەوێ لەنێو هەورەوە
گزنگ ببەخشێ بەو جەنگەڵانەی
بوونەتە مۆڵگەی گورگی گەورەوە

★ ★ ★

لەو مەملەکەتە گورگ زۆر بووەو
کەسێک دەست نابا بۆ تیرو کەوان
مناڵی ساواش ئۆقرەی نەماوەو
خەونی ترسناک دەبینێ شەوان

★ ★ ★

لــــه مەملەكـــــەتی گــــورگ و ڕێــــوی دا
گشـــت ڕۆژەكـــانم بـــــەڕێكرد بەجـــەنگ
لــــــەنێو ئەوهــــــەموو شــــەڕە كەڵبـــــەدا
وڵاتم بۆتـــــه گۆمێـــــك خـــــوێنی مــــــەنگ

★ ★ ★

مــــن دەزانم كــــــه هـــــۆنراوەی ســـــپی
دەبــــێ هـــــەر باســـــی گـــورگی ڕەش بكـــا
هــــەزاران نــــەفرەت لـــــەو هـــۆنراوە بـــێ
كــــه باســـی زولــــف و چـــاوی گـــەش بكـــا

★ ★ ★

خۆزگـــــه دەمتـــــوانی لــــەنێو بـــاخی ژیـــن
ئـــــا ئەوگورگانــــــه هــــــەمووی ڕامـــــاڵم
دەســــت بــــۆ لقــــی هـــــەر دارێـــك درێژكـــەم
پــــڕی میــــوە بێـــــت دەســــــتی بــــــەتاڵم

★ ★ ★

دنیـــــای بـــێ وەفـــا وەك كاروانێكــــە
هـــەزاران كۆســـپ دێتـــە چـــەقی ڕێـــت
لەلایــــەك گـــورگ كەڵبـــــەت بـــۆدێنێ
لەلایــــــەك دڕك دەچــــــەقێتە پێــــــت

★ ★ ★

لـــەناو خـــەڵكی چـــاك گـــورگ دیـــارەو
ســــــیمای دزێـــــوی ناشـــــــاردرێتەوە
گـــــورگ بچـــێتە كـــــەوڵی مـــــرۆڤیش
بــــــەرەفتاری خـــــۆی دەناســــــرێتەوە

★ ★ ★

ئـــــەم دارســـــتانە پـــڕ مەترســـــی یـــە
تـــەم و مـــژ هەرچـــوار دەورەی تـــەنیوە
لەترســـــی گـــورگ و ڕەشـــــەباو زریـــــان
عـــومرت ســـەد ســـاڵ بـــێ دەبێتـــە نیـــوە

★ ★ ★

زۆر لەمێـــژبوو مـــن چـــاوەڕێم دەكـــرد
دارســـــتانی ژیـــن پـــێ بگـــا بـــەری
كـــە ســـەیری دەكـــەم هـــەر درەختێكـــی
گورگێـــك نوســـتووە لـــەژێر ســـێبەری

★ ★ ★

تـــا دەســـتم لەســـەر تـــیرو كـــەوان بـــێ
مـــن هـــەرگیز ترســـم لـــەگورگ نیـــە
ئـەوەی قـاڵبووی نێـو چـڕنووك و خـوێن بـێ
هـــەرگیز نـــازانێ كەڵبـــەی تیژچـــیە

★ ★ ★

لەخورپـــــەی دڵـــــم كاریگـــــەرترە
قاســـپەو چـــریكەی ئـــەم كـــەوە جوانـــە
ئێمـــە لەكەڵبـــەی گـــورگ دەترســـین
بـــەڵام ترســـی ئـــەو لـــە بـــەردی شـــوانە

★ ★ ★

لــــــەنێو دارســــــتان گـــــورگ دادوەربـــــێ
دەبـــێ ســـەربوردەی باڵنـــدان چـــۆن بـــێ ؟
لـــــەنێو ئــــەم هــــەموو کەڵبــــە تیژانــــە
هـــەر دەبـــێ بـــۆنی کـــەلاکی کـــۆن بـــێ

★ ★ ★

وەك ئـــەو ســـیزیفەی کـــە باســـی دەکـــەن
تاشـــــە بـــــەردێکم داوە بـــــە کـــــۆڵا
لەگـــــەڵ گورگـــــدا بـــــۆ لوتکـــــە دەچـــــم
ڕێگـــــا ون دەکـــــەم لـــــە تـــــۆزو خـــــۆڵا

★ ★ ★

شمشــــــێرەکانتان لــــــەکالان دەرکــــــەن
گـــــورگ ڕژانـــــە نـــــاو دێهـــــات و شـــــار
گـــورگ برســـی بـــێ لەســـەر زگ دەخشـــێ
کەڵبـــەت بـــۆ دێـــنێ وەك مـــاری زامـــدار

★ ★ ★

مـــن هـــەر دادم بـــوو لەدەســـتی گـــورگ
کەچـــی گـــورگ وا بۆتـــە هاوڕێمـــان
ئـــای چ رۆژێکـــی مـــات و ســـاماناکە
لـــەداوی گـــورگ گیربـــووە پێمـــان

★ ★ ★

بـــەبێ ئـــەوەی کـــە ئاگامـــان لـــێ بـــێ
داومـــان لـــەداوی گـــورگ گیربـــووە
منالێـــك ئـــەمڕۆ لـــەدایك دەبـــێ
ســـبەی دەیبـــینی کـــەوا پیربـــووە

★ ★ ★

تـــۆ دەســـت مەخـــە نێـــو تـــەونی ئـــاڵۆزم
کـــــە ســـــەرەداوێك نادۆزیتـــــەوە
وەك گورگێـــك کـــەوا لـــێم دانووســـابێ
لـــــە هـــــەنگاونانم ورد ئەبیتـــــەوە

★ ★ ★

من نەم زانیوە گورگ دادوەربێ و
لێکۆڵینەوە بە کەڵبە بکا
لەقووڵاییما شەڕە کەڵبەیەو
هەرچی خوێن هەیە لە جەستەم تکا

★ ★ ★

لەوەتەی هەین و خۆمان ناسیوە
گورگ هاوبەشە لەم هەرێمەدا
بە کەڵبەی تیژو نینۆکی درێژ
ڕاموسان دەکا لەگەڵ ئێمەدا

★ ★ ★

ڕۆژانی سەختم ئەوەندە دیون
چەندین جار گورگ لەنیوەشەودا
بەماتە ماتە هاتۆتە ژوانم
یان پەلاماری داوم لەخەودا

★ ★ ★

لەسارای دڵما بەفر داناکاو
بەفر بارینم لەبیر چۆتەوە
لەپێدەشتێکی ڕەشماڵ نشینم
ماڵم ڕوو بە ڕووی گورگ بۆتەوە

★ ★ ★

هەتا مناڵ بووم گورگم نەدی بوو
دنیا لەلای من وەکو بەهەشت بوو
بۆ هەرلا دەچووم بەرچاوم ڕوون بوو
ڕۆژگارم هەمووی سەیران و گەشت بوو

★ ★ ★

کەهێشتا وێنەی گورگم نەدی بوو
گینگڵم ئەدا لەنێو ڤیاندا
ئێستاکە لەنێو دنیای گورگدا
تەرمێکم لەنێو کۆشی ژیاندا

★ ★ ★

فرمێســــــــكەكانت وەكـــــو يـــــاقوتن

كـــه تێكـــەڵ دەبـــن بـــەم خۆڵەمێشـــه

تـــۆ كەزامـــداری بـــه كەڵبـــەی گـــورگ

زامـــت بـــۆ ئێمـــەش هـــەر مايـــەی ئێشـــه

★ ★ ★

گـــــورگ وەكوئـــــەو بەردانـــــه وايـــــه

كـــه ڕێ دەگـــرن و ســـەريش دەشـــكێنن

گـــــورگی خۆمانـــــه گـــــەلێك دڕنـــــدەن

كەڵبـــه ژەهـــراوی و چـــڕنووك بـــەخوێنن

★ ★ ★

تـــــەم و مـــــژێكی ســـــپی وەك بـــــەفر

خـــۆی ئالآنـــدووە لـــه دۆنـــدی ســـەرم

ســـــينەی پڕئـــــاهم ئـــــۆقره نـــــاگرێ

تـــــاگورگ هـــــەبێ لـــــەدەورو بـــــەرم

★ ★ ★

گــــورگ بــــۆمن بــــوو بەکارەســــاتێك
مــــنی خســــتە ژێــــر بــــاری خەمــــەوە
وەك ئەوئەســــتێرەی لــــەناو هــــەور بــــێ
ســــەرم ون بــــووە لــــەنێو تەمــــەوە

★ ★ ★

خۆزگــەم بــەو ڕۆژەی ســەروپێ ی گــورگ
دەکەوتــــە ژێــــر پێــــی ڕێبوارانــــەوە
یــــان دەمــــدی لاشــــەی لەســــەر ڕێگــــادا
هەڵواســــــر'بوایە بــــــە دارانــــــەوە

★ ★ ★

لــــەم ولاّتــــەدا بــــەڕۆژو بەشــــەو
دەبــێ بــیرت هــەر لــەلای نــەبوون بــێ
نــەناو گورگانــدا قــەت ڕێــك ناکــەوێ
تــەنها ڕۆژێکــیش بەرچــاوت ڕوون بــێ

★ ★ ★

سێبەری ڕەشی گورگ و مرۆڤە
وەك دوكەڵی چڕ بەسەر شارەوە
لەجیاتی بەفر گوناھ دەبارێ
بە بارستایی گەڵای دارەوە

★ ★ ★

دەكرێ دەروونم وەكو ئاسمان
پڕی ئەستێرەی جریوەدار بێ
هەر ئەستێرەیەك زامێكی قووڵ بێ و
چڕنووكی گورگی پێوە دیار بێ

★ ★ ★

هەركاتێ گوێم لە دەنگی گورگ بێ
وازانم مردن لەدەرگام دەدا
گورگ ئاوێتەی ژیانم بووە
ڕەنگە تا مردن یەخەم بەرنەدا

★ ★ ★

شەوان لەخەوما شەپۆڵی خەیاڵ
دەمبا بۆلێوار کەناری یادێ
هەستم ڕادەگرم لەدەنگی گورگ
زۆر بەپەرۆشم هەتا ڕۆژ دادێ

★ ★ ★

مێخی ڕەشماڵان زۆرباش داکوتن
وا پایزێکی پڕ گەردەلوولە
گورگ و ڕەشەبا لوورە لووریان دێ
شوانیش لەپرخەی خەوێکی قووڵە

★ ★ ★

مێژووی هاوبەشم لەگەڵ گورگدا
دارێکە ڕەگ و ڕیشەی لەخوێنە
لەنێو ئاپۆڕای جانەوەراندا
بە تەنها گورگ وا خۆسەپێنە

★ ★ ★

مێژووی هەمیشە پڕ لە سەروەریم
لەگەڵ گورگدا چۆن بخوێنمەوە
گورگ ئاوێتەی ژیانم بووە
گورگ وەك میکرۆب چۆتە خوێنمەوە

★ ★ ★

لەگەڵ تەنیایی گوزەر دەکەم و
سەگێکیش نیە ببێتە هاوڕێم
گورگ لەدەورەم چنگەکڕە دەکا
خەریکە کەڵبەی نقوم کا لەپێم

★ ★ ★

لەگەڵ گورگدا کە تێکدەئاڵێم
چڕنووك گیردەکا لەجەستەو لەشما
جێ کەڵبەی گورگ هێندە پیس بووە
شەڕە میکرۆبە لە خوێنی گەشما

★ ★ ★

کەسێك شوان نەبێ و شوانی نەکردبێ
لە فرۆفێڵی گورگ نازانێ
نازانێ گورگ ئەگەر برسی بوو
لەچ کاتێکا دەچێتە ژوانێ

★ ★ ★

تاریکە شەوەو ڕێگا زۆر سەختە
گورگ وەستاون پۆل پۆل لەسەر ڕێم
لەو تەم و مژو ئەنگوستەچاوە
خوایە ڕوناکیت کەنگێ دەگا پێم

★ ★ ★

تا مانگی چواردە دەرنەکەوێت و
ئاسمان ئەستێران دانەگیرسێنێ
لە شەوەزەنگا ناکەومە ڕێگا
نەوەکو گورگ پەلامار بێنێ

★ ★ ★

لەمەملەکەتی گورگ سالاری

لەئێستاو سبەم زۆر بەگومانم

وا بەدەستی خۆم گۆڕ هەڵدەکەنم

بۆتەرمی خەونە سوتاوەکانم

★ ★ ★

لەم دارستانە مات و ساماناکە

ئەوەندەم گورگ دیوە بەچاوم

کە سێبەری خۆم لەپڕ دەبینم

وازانم گورگ دەورەیان داوم

★ ★ ★

بەهاتنی تۆ گورگ ڕایکردو

بەهار هاتەوە بە بارانەوە

درەختەکانیش وا سەما دەکەن

بەدەم کزەبای ئێوارانەوە

★ ★ ★

وێنــــەی دوو گـــورگ و ســـــەگێکی ســـپی

هەڵواســــــین بەســــــەر دەروازەی شـــــارا

هـــــەتا لـــــەبیرمان نەچـــێ ئـــــەو ڕۆژەی

گینگڵمـــــــــــان دەدا لـــــــــــەنێو ئـــــــــازارا

★ ★ ★

چــــاوەکانی مـــــــن پـــــڕن لەوێنـــــــــە

وێنـــەی . چـــۆن گـــورگ کەڵبـــە گـــیر دەکـــا

کەسێك نـــوقمی نێـــو حەســـڕەت و خـــوێن بـــێ

ئەوهـــــەموو ژانـــــە چـــۆن لـــەبیر دەکـــا .؟

★ ★ ★

هـــەزار ڕەحمـــەت لـــە گـــۆڕی ئـــەو باوکـــەم

ڕۆژێ لـــــــەڕۆژان خۆشــــــی نـــــــەدیوە

لــــــەزۆرانبازی لەگــــــەڵ گــــــورگ دا

ڕۆژێــــك ســــەرکەوتوو ڕۆژێــــك بــــەزیوە

★ ★ ★

داد بــــۆكێ ببــــەم لەترســــی گــــورگ
كــــێ هاوڕێمــــە لــــەو مــــان و نەمانــــە
تــــیرو كــــەوانێك بداتــــە دەســــتم
گــــورگ ڕاوبنــــێم لــــەم دارســــتانە

★ ★ ★

ئێوارەیــــەكی دەمــــەو پــــایزەو
ڕێگــــام ون بــــووە لــــە تــــەم ومــــژا
لــــە لــــوورە لــــووری گــــورگ ڕا دیــــارە
عاقیبــــەت شــــەڕم هــــاتووە بەگــــژا

★ ★ ★

خوزگــــە دەمتــــوانی لەســــەر پشــــتی مــــانگ
مــــاڵێكی بچــــوك بۆخــــۆم دروســــت كــــەم
دنیــــای پــــڕ گــــورگ بــــەجێ بهــــێڵم
كــــە وەك كەشــــتی یــــە لــــەنێو دەریــــای خــــەم

★ ★ ★

لەدەسـت ئـەو گورگـە بۆكـام لا بـڕۆین
لـەچ ئەشـكەوتێ خۆمـان حەشـار دەیـن
مـردین ئەوەنـدەی لەترسـی گـورگ
لـە گەرمێنـەوە بـۆ كوێسـتان غـاردەین

★ ★ ★

لەسـەر كانیاوێـك پـێم خسـتۆتە ئـاو
دڵـم خاڵییـە لـەترس و لـەرز
هـەر چـەن دەڕوانم گـورگ دیارنیـە
نـە لـە پێدەشـت و نـە لەچـیای بـەرز

★ ★ ★

لـەبن دارگوێزێـك لێـی ڕاكشـاوم
پاشـا بـەخیلی بـەژیانم دەبـا
نەحەپـەی سـەگ و نـەلوورەی گورگـە
سـنگم داوەتـە بەرشـنەی سـەبا

★ ★ ★

لەناو خەڵکی کوێر گورگ چاوساغە
دەیانبا بەرەو لێواری مردن
لەپێش ئێمەشدا خەڵکی تر هەبوون
ڕێگای وێڵ بەرەو هەڵدێری بردن

★ ★ ★

وەك ئەو هەورانەی بارانیان پێیە
بەلاّم نابارن و دێن تێدەپەڕن
ئێوەش خاوەنی بەهرەی جوانن
کەچی وەك گورگ خەریکی شەڕن

★ ★ ★

چاوم کردەوە بینیم دارستان
گورگ و چەقەڵی تیا دەلوورێنێ
گورگ هەیە لە پێستی مەڕدایە
لە غافڵ بوونا کەڵبەت بۆ دێنێ

★ ★ ★

شەوڕاشــــــکابوو شـــــوانیش خــــــەوتبوو

کـــــە گـــورگ دزەی کـــردە نـــــاو خـــــێڵم

لـــەو ڕۆژەی گـــورگ کەوتۆتــــە ناومـــــان

مـــن لـــە زێـــدی خـــۆم هەمیشـــە وێڵـــم

★ ★ ★

ســـــپێدان کـــــاتێ لەخــــەو هەڵدەســــتم

گورگێــــــك دەبیـــــنم لەبـــــەر پەنجــــەرە

وێنـــــەی ئـــەو گـــۆڕەم دێتـــەوە بەرچـــاو

کـــــە پـــڕی قـــــاچ و قەپێلکــــــە ســــەرە

★ ★ ★

خۆزگـــــەم بەوکەســــەی گـــورگی نـــــەدیوەو

دەســــــتی نـــــــەداوە لـــــەتیرو کـــــــەوان

نـــــــازانێ گــــــورگ چ دەعبایەکـــــــــەو

بـــەبێ تـــرس و بـــیم تێـــر دەنـــوێ شـــەوان

★ ★ ★

سەربوردەی ئێمە لەگەڵ گورگدا
هەمیشەیی یەو نابڕێتەوە
وێنەی گورگ لە زەین و هزرمدا
بۆتە هێمایەك ناسڕێتەوە

★ ★ ★

کە سەرگوزەشتەی خۆم دەنووسمەوە
هیچ دێریك نیە گورگی تیا نەبێ
هەزاران نەفرەت لەو ڕابردووە
کە مێژووم لەگەل گورگ جیا نەبێ

★ ★ ★

ئێوارەیەکی پڕ تەمتومانەو
خەونەکانمی تیا خنکاوە
دارستانی ژین لەسایەی گورگا
وەك جەنگەڵێکی بێ خۆرەتاوە

★ ★ ★

تەم و مژێکی دەمەو ئێوارە
ئەم دارستانەی گرتۆتە باوەش
باڵندەکانیش وێڵ و تەرا بوون
لەبەر خشپەی پێ و لوورەی گورگە ڕەش

★ ★ ★

هێشتا منداڵ بووم هەستم بەوە کرد
دارستانی ژین سەرتاپای گورگە
هەموو مەرامی گورگیش لەژینا
تەنها پڕبوونی هەمبانەی ورگە

★ ★ ★

وەك ڕەشەبایەك لەناكاو هاتی
سەرت لەپرچی مندا گیربووە
ڕنەو چەپۆکت سست و لاوازن
وەکو ئەو گورگەی کە زۆر پیربووە

★ ★ ★

سەگەکەم جارجار حەپەحەپی بوو
دەیگووت گورگ بێ خۆم ڕاوی دەنێم
ئێستا ئەو سەگە وەکو گورگی ڕەش
خۆی مەلاس داوە لەسەر چەقی ڕێم

★ ★ ★

جاران من لەبەر گورگی پێ پەتی
هەڵەتە دەبووم لەو دێ بۆ ئەم دێ
ئێستاکەش لەبەر گورگی خۆماڵی
گورگی پێ پەتی لوورەی زۆر کەم دێ

★ ★ ★

لەوەتەی گورگ کەوتۆتە ناومان
ڕۆژ نیە خوێن نەڕژێتە سەرخوێن
قەپێلکە سەری من و تۆیە وا
گورگ پێی دەکەن شەڕە تۆپ تۆپێن

★ ★ ★

هـــــەرکاتێ ڕێچـــــکەی گـــــورگ دەبیـــــنم
ســـەد نـــەفرەت دەکـــەم لەشـــوێن پێکـــانی
خۆزگـــە دەخـــوازم دنیـــا کـــاول بـــێ و
هاتوچـــــۆ نـــــەکا گـــــورگ لـــــەبانی

★ ★ ★

چـــۆن تـــەور عەشـــقی ڕەگـــی درەختـــەو
دەیـــــەوێ ڕیشـــــەی دەربـــــێنێ لـــــەبن
گـــورگیش هەمیشـــە تێنـــووی خوێنمـــەو
بۆتـــە قانـــدڕی شـــیلەی ســـەری مـــن

★ ★ ★

لەســـــایەی بـــارو دۆخـــی بـــێ شـــوانی
هـــــەموو ســـــاڵێکمان هـــــات و نەهاتـــــە
ڕۆژێـــــک بـــــەگورگ دەمـــــان ترســـــێنن
ڕۆژێکـــــیش بـــــۆ نـــــان شـــــار کزوماتـــــە

★ ★ ★

کەوێڵم نووقمی نێو تەم و مژەو
ئاگردانیشم ساردە بێ پشکۆ
ئای کە ناچارم لەم دارستانە
لەگەڵ گورگدا بکەم هاموشۆ

★ ★ ★

لەبەر پەنجەرە گورگێك دیارە
زۆر دڕندانە پەلامار دەدا
ناوێرم چاوم بخەمە سەریەك
نەوەك بێتە ژوور لە دەرگاکەدا

★ ★ ★

بابەشێخ گورگەو ڕێوی دەروێشە
لەزگماکیشا حەشیشە خۆرن
خۆراکی لەشیان قاوەو فنجانەو
سەگی بەردەرگاش بۆ ئەوان زۆرن

★ ★ ★

خۆراکی چاوم دیمەنی جوانە

دیمەنی شاخ و پێدەشت و ڕووبار

بینینی گورگ و ڕێوی و قەلەڕەش

لەم دیمەنانە بێزارم بێزار

★ ★ ★

ئەو گەردەلوولە ئەوەندە سەختە

دەرگاو پەنجەرە دەخاتە سەر پشت

لەترسی گورگ و لرفەلرفی با

لەچاوەکانما ئەشکی زۆرم ڕشت

★ ★ ★

چەندین جار دیومە زریانی سەخت

سەروپەرچەمی دار بشێوێنێ

یان شەوان گورگ لوورە لووری بێ و

لەچاوی منداڵ خەو بتۆرێنێ

★ ★ ★

گورگ تاعون بوو تاعونێکی پیس
قڕانی خستە ناو گەل و هۆزم
چەندین ساڵە من هاوار دەکەم و
کەس گوێ ناگرێ لە ناڵەوسۆزم

★ ★ ★

کاتێ کە ئادەم هاتە سەر زەوی
نە گورگ هەبوو نە تیرو شمشێر
لەنێو ماڵێکی قامیشەڵاندا
شەوان دەخەوت لەسەر زگی تێر

★ ★ ★

مرۆڤ ئەوکاتە زۆر بەختەوەر بوو
کە بەبێ گورگ دەژیا بەخۆشی
بێ جل و بەرگ ڕووت و ڕەجاڵ بوو
بە خوری و مەرەز خۆی دادەپۆشی

★ ★ ★

ئـــــای میکرۆبێکـــــی چـــــەند بـــــەئازارە
دەریـــــای بـــــرینم هـــــەمووی تـــــەی دەکـــــا
ئـــــەوەی کـــــە گـــــورگ بـــــە کەڵبـــــە نـــــەیکرد
ئـــــەو لـــــەناو خوێنمـــــا بـــــە ئێمـــــەی دەکـــــا

★ ★ ★

لـــــەبیابانێکی وێـــــڵ و ســـــەرگەردان
بـــــۆنی دوکـــــەڵ و ژیلـــــەمۆی لـــــێ دێ
کـــــاروانی ژیـــــنم لەدەســـــت گورگایـــــەو
نـــــازانم لـــــەکوێ کۆتـــــایی پـــــێ دێ

★ ★ ★

مـــــن منـــــاڵێکی بـــــێ سەرپەرشـــــتم
ئـــــامێزی دایکـــــم بـــــزر کـــــردووە
خـــــۆی ســـــەپاندووە گـــــورگ بەســـــەرما
خەونـــــەکانمی لـــــەبار بـــــردووە

★ ★ ★

لەئاســـــــــۆیەکی تەمتومانـــــــەوە
تارمـــــایی بۆتـــــە ڕەشمـــــاڵی ژیـــــنم
لـــــە ڕۆژگـــــارێکی پڕلــــــە گورگـــــەوە
بەقـــــەد میســـــقالێك شـــــادو گەشـــــبینم

★ ★ ★

شـــــەو لەخەونمـــــدا گـــــورگم ڕاو دەکـــــرد
تـــــیرو کـــــەوانێك لەدەســـــتم دابـــــوو
ســـــواری ئەســـــپێك بـــــووم تـــــەکانی دەدا
کـــــە دەیحیلانـــــد وەك بروســـــکەو بـــــابوو

★ ★ ★

لـــــەنێو ژوورێکـــــدام بـــــێ پەنجەرەیـــــەو
درزێکـــــی نیـــــە بـــــۆ بینـــــینی خـــــۆر
هـــــەر لـــــوورەی گـــــورگ دێتـــــە گوێمـــــەوە
حەپـــــەی ســـــەگێکیش نایـــــە کـــــەم و زۆر

★ ★ ★

گۆچـــانی دەســـتم نـــابێ فرێـــدەم
تـــا ترســـی گـــورگ لـــەئارا دابـــێ
هێشـــتا دودڵـــم لەچارەنووســـم
ڕەنگـــە ژیـــانم هەتاســـەر وابـــێ

★ ★ ★

بـــرینی کـــۆنم هاتنـــەوە ژان و
وا گینگـــڵ دەدەم لـــەنێو ئـــازاردا
گورگێـــك دەڕوات و گـــورگێکی تـــردێ
گورگبـــازی یـــە لـــەدێ و لەشـــاردا

★ ★ ★

تـــۆ ئـــەو شـــوانە بـــووی هـــەروەکو گـــورگ
بـــزەت دەتۆرانـــد لـــەلێوی منـــاڵ
گـــۆزەی شـــەڕابت لـــێ دەشـــکاندن و
دەگەڕانـــەوە بەدەســـتی بـــەتاڵ

★ ★ ★

لــــەو رۆژەی کـــــەوا ســـێوەکەمان خـــــوارد
خـــوا باخچـــەی ژیـــنی لێمـــان ســـەندەوە
کەوتینــــــــە زەوی و لەگـــــــەڵ گورگـــــــدا
پێمـــان کەوتـــە نێـــو کـــۆت و بەنـــدەوە

★ ★ ★

لــەخاك پەیـــدا بـــووین دەبینـــەوە خـــاك
بۆیـــــە خــــاك وەهــــا لـــەلام پـــیرۆزە
بـــــەلاّم هـــــەرخاکێك گـــورگی تێـــدابێ
مەملەکـــــەتێکی بــــێ گـــــەل و هـــــۆزە

★ ★ ★

ئەگـــەر تەمـــــەنت هـــەزار ســـاڵیش بـــێ
هــــــەردەبێ ســـــەرت ببەخشـــی بـــەخاك
بـــــەلاّم لێــــرە کـــەس بـــەمردن نـــامرێ
یــان گــورگ دەیخــوا یــان مــاری زوحــاك

★ ★ ★

من بەم دەستانە گوڵەگەنمم چاند
ئەوەی شین بووە دڕك و زیوانە
هەرنائومێدی دروێنە دەکەم
سەدەی دێوەزمەو ڕنەی گورگانە

★ ★ ★

شمشاڵی شوانێك دێتە گوێمەوە
کە گەرووی پڕە لەسرودی خۆش
شمشاڵێك باسی گورگ و مەڕ دەکا
هەموو ویژدانێك دەهێنێتە جۆش

★ ★ ★

ئەو باڵندانەی بەسەر دارەوەن
گورگ ناتوانێ دەمیان لێ بدا
گورگ ئەو بێچووە بچوکە دەخوا
نەتوانێ بفڕێ و تازە پێ بدا

★ ★ ★

هەندێجار گورگ کە دەلوورێنێ
تەونی هۆنراوەم لێ ئاڵۆز دەبێ
بەڵام هەر دێرێك گورگی تێدابێ
هۆنراوەیەکی پڕ لەسۆز دەبێ

★ ★ ★

ئای چەند دەترسم لەرۆژێکی وا
تاریك دابێت و چرا نەمێنێ
شەوگاری درێژ ڕۆژ داپۆشێت و
گورگ لەناویا سەری دەربێنێ

★ ★ ★

ئەمشەو خەڵکی دێ لەپرخەی خەودان
تەنها من نەبێ خەو لێم تۆراوە
دانیشتووم بەدیار حەپەی سەگەکەم
تۆبڵێی گورگ بێ لەکام لاوە

★ ★ ★

چۆلەکەیەکیش کە زۆر بچوکە
وەك مرۆڤ وایە لە هەست کردنا
ئەویش هەمیشە خۆی دەپارێزێ
لەترسی گورگ و لەدەست مردنا

★ ★ ★

کاتێ پەنجەرە دەخەمە سەرپشت
گڕی چەخماخەی هەور دەبینم
بەگرمەی هەورو بەلوورەی گورگ
چاك وێران بووە هێلانەی ژینم

★ ★ ★

گەر پرشنگ بمرێ لەنیگای خۆردا
یان ئەستێرە وەك گەڵا هەڵوەرن
من سارد نابمەوەو گەرمتر دەبم
بۆ ئەوگورگانەی کە دەردی سەرن

★ ★ ★

بۆئـــەوەی کـــە چـــۆن گـــورگ ڕاو بکـــەم
ســــــەرم هەمیشـــــە پـــــڕی خەیاڵـــــە
ســـەرێك بـــەدور بـــێ لەئەندێشـــەو خـــەم
بـــێ کەڵکـــە وەکـــو گـــۆزەی بەتاڵـــە

★ ★ ★

بۆیـــــە متمانـــــەم بـــــەتۆ نـــــەماوە
لـــە ئـــەزموونی تـــۆ بـــاوەڕ دیارنیـــە
بـــەپێی ئـــەو گورگـــەی کـــە ڕێچـکەی دیـــارە
تـــۆ هـــیچ ئاگـــات لـــە گونـــدو شـــارنیە

★ ★ ★

لـــــــــەئاقارێکی دور لەگورگـــــــــەوە
خـــۆم داوەتـــە بـــەر گزنگـــی هـــەتاو
لەســــەر نەرمــــەگیا گــــەوز دەدەم و
پـــێم خســـتۆتە نـــاو جۆگەلـــەی پـــڕ ئـــاو

★ ★ ★

لەخۆڵەمێشی گورگی زەبەلاح
چەند گورگێکی تر دروست بوونەوە
بەخیلی دەبەم بەو ڕێبوارانەی
بەرەو قووڵایی عەدەم چوونەوە

★ ★ ★

تاریکی چین چین کەوتۆتە سەریەك
هیچ کەس ناتوانێ سەری لێ دەرکا
گورگ هەنگاوی کوێرانە داوێ
بۆیە دەتوانێ پێیدا گوزەرکا

★ ★ ★

زامەکانی من هەرچەند وردیلەن
بەڵام چەندەکەم بۆم سارێژ نابن
ڕەنگە لەکاتی کەڵبە لێدانا
ددانی گورگیان تیا بەجێ مابن

★ ★ ★

لــــەڕۆژگارێکا کــــە زۆر کەمـــــە ســــەگ
دەبــێ گۆچــانمان هــەردەم لەدەســت بــێ
خشـــــپەی مێروولـــــە بێــــدارمان بکــــا
نـــەك چــاوەکانمان خـــەواڵوو و مەســت بــێ

★ ★ ★

لـــەنێو باخێکـــا نـــوقمی خـــەیاڵ بـــووم
دەمگــــووت تـــۆبڵێی ئـــەو ڕۆژە دابـــێ
هێمــــاو تارمــــایی گـــورگ نـــەمێنێ و
تـــــرس و دودڵــــی لێـــــرە ئـــــاوابێ

★ ★ ★

کــــەی ڕۆژێــــك دادێ گـــورگ نـــەمێنێ و
تریفـــــەی ســــپی دابــــارێ بـــۆ گشـــت
بەدەســــــتێکەوە وەك دەســـــــتی نـــــزا
دەرگـــا لــــەلوتفت بخەمـــە ســـەر پشـــت

★ ★ ★

لەنێو کەلاوەی خاپورکراوەوە
دەڕوانمە گۆزەی شکاوی بەختم
تاهێمای گورگ لەبەر چاوم بێ
ئالۆزتر دەبێ ژیانی سەختم

★ ★ ★

کڵوەبەفرەکان وەکو پەپوولە
دادەبارێن و خاك دادەپۆشن
گورگەکان بەدوای نێچیر دەگەڕێن
گەر تەم و مژبێ زۆریش دڵخۆشن

★ ★ ★

چەندین ساڵەمن بەهۆی گورگەوە
سەوزی بەهارم بزر کردووە
بۆیە ڕۆحم بە باران تەڕنابێ و
تامی باران لە دڵما مردووە

★ ★ ★

مــــن خـــوێنی خـــۆمم ڕشـــته مــــەتارە

بۆئـــــەو شــــوانەی کـــــەوا خوێنمـــــژە

مەترســـــی گـــــورگ گـــــەلێك کــــەمترە

لەوشــــوانەی هــــــەردەم لەگـــــەڵمان دژە

★ ★ ★

بۆکـــــام لا بچــــم کەڵبـــــەو چــــەنگاڵە

پەشـــــێویش دیـــــارە بەڕوخســـــارمەوە

لـــــــــەنێو گێـــــــژاوی نائارامیـــــــــدا

خـــــۆم لــــەو گورگانــــە چـــۆن بشـــارمەوە

★ ★ ★

ســـــندمیان کــــــردە هـــــەردوو پێمـــــەوە

هــــــەتا نـــــەتوانم هـــــەنگاو هــــەڵبێنم

یـــان بەســـەر کۆســـپەی بەرپێمـــدا بجمـــێم

گــــورگ بـــــەبێ ڕەنـــــج فڕبکـــــا خـــــوێنم

★ ★ ★

خـــۆ هەرئەوانـــەی کـــە دوێـــنێ ســـەگ بـــوون
ئـــــەمرۆ بوونەتـــــە گـــــورگی بـــــێ وێنـــــە
ژن و منـــــــاڵ و گـــــــەوره ناپرســـــــن
خـــۆراکی لەشـــیان هـــەر گۆشـــت و خوێنـــە

★ ★ ★

بـــــەخیلی دەبـــــەم مـــــن بەوشـــــوانەی
بـــۆ لـــــەوەڕگای خـــــۆش مێگـــــەل ڕائـــــەدا
نـــــە گـــــوێی لـــــەگورگ و شـــــێوەکانێتی
نـــــە گـــوێ بەلرفـــــە لـــــرق بـــــا ئـــــەدا

★ ★ ★

مـــــن بـــــای ئەوەنـــــدە مەینـــــەتیم دیـــــوە
لەدەســـــت ڕەشـــــەبا هـــــەرەس نـــــەهێنم
لەهـــــەر جێگایـــــەك گـــــورگ زاڵ بـــــبێ
قوربـــــانی دەدەم بـــــەگیان و خـــــوێنم

★ ★ ★

چ دۆزەخێکـــــی بـــێ ئامانـــــە ژیـــــن
لـــــە ئازاردانـــــا کـــەس وەپـــــاش نـــــادا
هـــــەرگورگ تێیـــــدا دەگوزەرێـــــت و
زۆربەختـــــەوەرە گـــــەر کلکـــــی بـــــادا

★ ★ ★

زریـــــان نـــــەیتوانی ســـــەری مـــــن بـــــادا
کـــە چـــەندین ســـاڵە مـــن لەبـــەر بـــادام
بـــەڵام کـــەگورگ لـــووره لـــووری هـــات
ئاراســـتەی گـــۆڕیم ســـەری پـــێ بـــادام

★ ★ ★

تفەنگـــــەکانتان ڕوو لەچـــــیاکەن
گـــــورگ لـــــەوێوە دێنـــــە خـــــوارەوە
دارو بـــــەرد نـــــەما گـــــڵاوی نەکـــــەن
ئینجـــا گـــەرای پـــیس دێننـــە شـــارەوە

★ ★ ★

گورگ دەیەوێ خۆی بکا بەدۆست
سەری بخاتە سەرسەرینەکەم
بەزمانی پیس و پڕلەمیکرۆبی
بلێسێتەوە جێ برینەکەم

*　　　*　　　*

تۆ لەوەرزێکی تاریکدا هاتی
بۆیە هەمیشە بەرچاوت لێڵە
سۆراغی سەری گورگم بۆمەکە
لەکاتێکا تۆ سەری خۆت وێڵە

*　　　*　　　*

لەنێو ئەو هەورو تەم و مژەدا
خۆر وەکو چرا زۆرکز دیارە
دەبێ پەنایەك بدۆزینەوە
کە داڵدەمان دات لەو گورگە هارە

*　　　*　　　*

لەنێو ژیلەمۆ و کێڵگەی ئاگردا
گوڵە گەنمەکان قەت سەوز نابن
کێڵگەکان لانەی گورگ و چەقەڵن
بەتەقەی تفەنگ تۆبڵێی ڕابن

★ ★ ★

ڕەنگە بپرسن بۆچی ئەو مەلە
وا لەهێلانەو زێدی تۆراوە
کانی و کێڵگەکان هەمووی هەرگورگە
ئەویش دەمێکە بێ دان و ئاوە

★ ★ ★

ئەم هەسارەیە وەها پیس بووە
هەناسەی پاکی تێدا نەماوە
مەملەکەتی وا بۆگورگ باشە
کەپڕی تۆڕو تەلبەندو داوە

★ ★ ★

ئـــازاری قامچـــی ئـــەو ڕەشـــەبایە

هـــیچ گـــەڵای نەهێشـــت بـــەڕووی دارەوە

چـــەند دڵ تـــەنگم بـــە هەڕەشـــەی گـــورگ

هێنـــــدەش بەســــەرمای بـــــەفرانبارەوە

★ ★ ★

تـــۆ قامچـــی دەســـتت وەك کەڵبـــەی گورگـــەو

لـــــەگورگ زیــــاتر ئازارمــــان دەدەی

خـــۆت لەســـەر شـــێوەی گـــورگ مەنوێنـــە

کـــە تـــۆ دڕنـــدەو دەعبـــای ئـــەم سـەدەی

★ ★ ★

ئـەی شـوانی دەنـگ خـۆش فووکـە لەشمشـاڵ

دڵـــی پـــەژموردەم زینـــدوو کـــەرەوە

ڕۆژانـــی گـــورگ و حەســـرەت و خـــەمم

بـــەئاوازی خـــۆش لـــەبیر بـــەرەوە

★ ★ ★

دڵم دارێکی ڕۆخ گۆڕستانە
خەیاڵی مردن دەیباو دەیهێنێ
مەترسی گورگ لەدڵما نەما
ئێستاکە مەرگ تینم بۆ دێنێ

★ ★ ★

ڕۆژانی تەمەن خێرا تێپەڕین
خۆشی و ناخۆشی بوون بەیادگاری
یادگاری گورگ و تفەنگ و چیا
دایان لەشەقەی باڵ وەك پاساری

★ ★ ★

من وەکو هەور بارانم پێیە
بارانی وشە نەك بارانی ئاو
هەموو وشەکان باسی گورگ بێ
هێشتا چامەکەم بۆ نابێ تەواو

★ ★ ★



له گوندی (ئەسپیندارە)ی سەر بە ناوچەی خۆشناوەتی لە دایکبووە، لە حوجرەکانی هیران ـ شەقڵاوە ـ کۆیێ ـ هەولێر، خوێندوویەتی، پاشان بەهۆی بارو زروفی کوردستان و پرۆسەی ڕاگواستن و خاپورکردنی گوندەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە وازی لەخوێندن هێناوە و ئێستاش خەریکی کاسبییە، هیچ وەزیفەیەکی حکومی نیەو دەیەوێ بەڕەنجی دەست و بازووی خۆی بژێت و منەتی کەسی بەسەرەوە نەبێ.

Necat Espîndareyî

Şîr

Gurgname



چاپخانەی ڕۆژهەلات ـ هەولێر

دیزاین: ئاکار جەلیل کاکەوەیس